19

ح. شەبەق

# بۆ هەواران دێمەوە

پێشەکی، لێکۆڵینەوە و ئامادەکردنی
ئەنوەر حسێن (بازگر)

2021

# بۆ هەواران دێمەوە


| | |
|---|---|
| بابەت : | دیوانی شیعری ح. شەبەق |
| پێشەکی، لێکۆڵینەوە و ئامادەکردن: | ئەنوەر حسێن (بازگر) |
| پێداچوونەوە: | هیوا کازم |
| دیزاینی ناوەوە: | ئومێد محەمەد |
| بەرگ: | ئارام عەلی |
| چاپی یەکەم: | 2021 |
| چاپ : | ئایدیا |
| نرخ: | 4000 دینار |

لەبەڕێوەبەرێتی گشتیی کتێبخانەکان
ژمارەی سپاردنی (1622)ی ساڵی 2020 پێدراوە

# پێرست

# شەبەق دەبێ بخوێندرێتەوە

حسێن شەبەق، چ لە سیما و ڕوخساریدا دەڵێی نەورەسی سەر دەریاکانە، هێدی، هێمن و ناسک، چ لە شیعرەکانیدا بە زمانێکی سادە و بێ گرێ و گۆڵ دەدوێ، سادە، لێوانلێوە لە ژیان و عیشق و خۆشەویستی، سادە و تەنیا، بەڵام پڕ پڕ لە مانا و مەدلوول، پڕ پڕ لە هەناسەی گڕگرتووی ناو ژیانێکی پڕ چەرمەسەری، ڕەنج و ئازار.

وەسفی ژیان دەکات لەناو بیابانی قات و قڕ، بەڵام هیوا دەبەخشێت بە ژیان، وەسفی ژیان دەکات لەناو تۆپباران و ژانی پڕ لە ئازار لەناو هەورامان و بۆتێ، بەڵام وەکو سیمبولی خۆڕاگری و هەستانەوە.

باسی یاد و یادگاری ئەو هاوڕێ ئازیزانە دەکات، کە سەرمایەی ئینسانی خۆیان، لەسەر خاکی سوتماکی، ئاسمانی شینی پڕ ئەستێرەی سور فیداکرد و گیانیان بەختکرد، بەڵام هەناسەی بۆنی بۆسۆی زەمەن و یادگاری پڕ لە یاد و بیرەوەری لێدێت.

بۆنی ژان و حەسرەتی یارانی لەدەستچوو، بەڵام بۆنێک وەکو میسک و بوخورد لە دوڕا هەست بە ڕاستی و واقیعییەتی دەکەی، کە پڕە لە وەفا، سۆز، حەماسەت و خۆ بە قەدر زانی ئەو کچ و کوڕانەی زوو ناسینی و زوو جێیانهێشت و ئاوابوون، بەڵام درەنگ و هەرگیز لە یادیان ناکات، شیعرەکانی حسێن شەبەق پڕن لە ژیان و ژیاندۆستی لەناو باوەشی مەرگ و مەرگدۆستی جەنگەڵانی پڕ تاوانی جەلادەکاندا.

شەبەق، حیکایەتی ژیان و جوانییەکانی دەگێڕێتەوە لە ڕێگای گیانبەختکردووەکانەوە، بەڵام ڕەمز و سیمبوڵ و گیانلەدەستدانی هاوڕێکانی شەبەق جیاوازترن لە مردووەکانی گۆڕستان و مردووەکانی

ئەم لە پێناوی ژیاندا، لە پێناوی سۆسیالیزمدا، لە پێناوی ئازادی و نیشتمان و عیشق باوەشیان کرد بە ژیاندا و گیانیان بەختکرد.

مردوەکانی ئەو لە هەموو کەس عاشقتر بوون، لە هەموو کەس سیمای ژیان و ئازار و مەینەتی بە ڕوویاندا دیار بوو، مردوەکانی ئەو ئینسان و سیمبوڵە زیندوەکانی گەڕەکەکانی هەژار ئاوا، ستەم ئاوا و فەقیر ئاوا بە ناوچەوان و قەد و باڵای بەژن بەرزیاندا دەناسرانەوە.

وەکو بەختیار عەلی لە بارەی شێرکۆ بێکەسەوە دەڵێت «مردن هەمیشە بەشێکی گرنگی جیهانبینی شێرکۆ بوو، بەڵام شێرکۆ لەو شاعیرانەیە کە دەتوانین بە شاعیرانی ژیان ناویان بەرین، زۆر لەسەر مردوەکانی نوسیوە، نا بۆ ئەوەی مردنیان بگێڕێتەوە، بەڵکو بۆ ئەوەی زیندویان بکاتەوە، نوسین لای شێرکۆ پرۆسەی ژیان بە بەرداکردن بوە».

لای شەبەق، مردن پرۆسەیەکی ترسنۆکانە و کۆتایی ژیان نییە، ئەگەرچی فیزیکی وا لێی بڕوانرێ، بەڵام لە حاست بەرزی ئینسانەکان و ڕوحی جاویدانی و ئاسمانی پڕ لە ئەستێرەی ئەوان، باس لە مردن بە زیندوو ڕاگرتنی ژیانە، زیندوو ڕاگرتنی یاد و بیرەوەری هەرگیز نەبڕاوەی ئەو چهرە و دەنگ و زەمزەمەی شادی و نەمرییە کە ناکرێت ناوی مردویان لەسەر دابنێت، مردوەکانی شەبەق ئەوانەن چەندین ساڵ لە باوەشی مەرگدا دەجەنگان بۆ ژیان، ئەوانەن لەژێر لێفە و خێمەی کون کونەوە، هەزاران خەونی ڕەنگاڵەییان بۆ ژیان دەچنی، مردوەکانی شەبەق ئەو سیمبوڵ و خۆشەویستانەن وەکو بەرێزترین ئینسانەکانی سەر گۆی زەوی تەنها و تەنها بە دوای ئازادی و سۆسیالیزم، گوڵ و نان و عیشق و موحبەت، جوانی

و ئاوەدانی و کۆتاییهاتن بە ستەم و چەوسانەوە بوون، ئەو ئینسانانەن کە ژیان و بەرامەی ژیان لە سایەی ئەوانەوە گوڵ دەگرێ و باڵا دەکات، ئەو ئینسانانەن تەلیسمی چاویان پڕ پڕە لە یادگاری و بێ قەراری، باڵایان لە چنار بەرزترە لە جیهانی دۆڕاو و تەسلیم بوەکان.

حسێن شەبەق، ئینسانی شۆڕشگێڕی لەشێوەی ئەوەی نیچە دروستدەکات و ڕاز و ڕەمزەکانی دەگێڕێتەوە و مێژوو دەنوسێتەوە بێ گرێ و گۆڵ، فەرشی ژیان دەچنێ بە تانوپۆی ڕوح و عیشقی ئەبەدی.

لە کتێبی پارادۆکسی نوسینی ڕەبیع جابر، کە شوان ئەحمەد وەریگێڕاوە لە بارەی کافکاوە دەنوسێت «سەر وەختێک کافکا دەخوێنیتەوە، هەست دەکەیت پێشتر ناسیوتە، ئەیناسیت و نایناسیت، ئایا ئەیناسین؟ کافکا بنەماڵەیەکی لە دوای خۆی بەجێهێشت درێژ دەبێتەوە و درێژ دەبێتەوە بە جۆرێک باز بەسەر ساتەوەختی ئێستاماندا دەدات».

ناسینی حسێن شەبەقیش هەر وایە، کاتێک شیعرەکانی دەخوێنیتەوە، وا هەست دەکەی ئەم شیعرە یان ئەم حیکایەت و چیرۆکەت پێشتر بینیوە، بیستوتە و خوێندوتەتەوە، یان ئەو ڕوداوگەلە بە بەرچاودا ڕەت بوە.

گەر دەتەوێت هەوارانی سەخت و دژوار وێنا کەیت؟ گەر دەتەوێت وەسفی چەمشار، پاوە، شاخی هەورامان، سنە و کامیاران بکەیت، زۆر مەڕۆ، وەرە شیعری (بۆ هەواران دێمەوە) بخوێنەرەوە و سەرنج بدە چ وەسفێکی پڕ لە ئارەزووی ئاوەز بڵند بە گوێی ئینسانیماندا دەدات، چۆن باس لە ترپەکانی دڵی شۆڕش دەکات وەکو عیشقی شەم دەکاتە ڕازی دڵی دەرونی پڕ

لە کوڵ و وەکو وشەی نەرمە باو و بارانی پایزانە دەیخاتە دوو توێی گەڵا و گوڵی رژاوی سروشتەوە و بۆن و بەرامە دەخاتە دڵی شکاوی بەجێماوی دوور لە یاران و ئازیزانی، بە تەنها بەسە حیکایەتی (ئالان کوردی یان کۆبانێ)ت گوێ لێ بووبێت، ئەوەی تر شەبەق ئەم حیکایەتە کوردییە، تراژیدییە، سامناکە دەگێڕێتەوە، گەر ئەو نەبێت وەکو یەکێک لە شاعیرانی کورد، ڕەنگە دەیان ساڵی تر ئەم کارەسات و حیکایەتە مەرگدۆستە، سەر و سەودای دیار نەمێنێ و چیرۆکەکەش بە جۆرێک کە ڕاوچیانی دڵی دەریای ئیجە بینوسنەوە و ئالانیش وەکو کوردێکی بێ ناسنامە و بێ حاڵ و ماڵ و تاوانبار لە قەڵەمبدەن.

شەبەق، لەبەرئەوەی خۆی مێژووی نەهامەتی، شۆڕش، قوربانیدان و خۆڕاگری کارەساتە گەورەکانە، بۆیە ئەم مێژوە پڕ لە تراژیدیا و چەوسانەوە و کارەساتە یەک لە دوای یەکە بە شیعر یاداشت دەکات و سادە و ساکار، ئارام ئارام، فۆرمی شیعری بە بەردا دەکات.

یەکێکی تر لە خەسڵەت و سیما هەرە دیارەکانی شەبەق، شیعر و ئەدەبیاتی بەرگری و چینایەتی و کرێکارییە، ئەو لە زومرەی ئەو شاعیرانەیە، کە لەسەر ڕێباز و ئارمان و ئامانجە ئینسانی و هیومانیستی و چینایەتییەکانی وەفادار مایەوە، ئەو بۆچوونەشم لە ڕوانگە و فاکت و واقیعییەتی شیعرەکانییەوە، دەتوانم سابتی بکەم و بیسەلمێنم، نەک هەر لە خۆڕا، واتا شیعر و واقیعییەتی دەقە زهنییەکانی کە دەیبینین و هەستی پێدەکەین، ئەوەیە کە بە خوێن و ئێسکەوە بە هەموو ئاماژە و دەلالەتەکانی بە هەموو تێڕوانینە جیاواز، ئیدۆلۆژی، نیشتمانی و ئینسانییەکانەوە، شەبەق شاعیری چەوساوەکان و بەش مەینەتان و قوربانییەکانی کۆمەڵگەی کوردستانن، شەبەق هێشتا و پاش دوو دەیە لە ئەوروپا دڵی

مۆدێرنە، لە هەوا و هەوەسی کوردستان ژیان دەکات و دەق بەرهەم دەهێنێت و خەیاڵ دەچنێ و خەون دەبینێ و خۆزگەی وەنەوشەیی دەبەخشێتەوە و دڵەکان مەرهەم دەکات.

هێشتا بە یادی ڕۆژانی شۆڕش و مقاوەمەت، جەسوری هاوڕێیانی دەگێڕێتەوە، شین-یان بۆ دەکات و شاییان بۆ دەگێڕێت، ئەو یاد و بیرەوەرییانە پیرۆز ڕادەگرێت لە چوارچێوەی شیعری چینایەتی قاڵبیان بۆ دروست دەکات بۆ ئەوەی هەستی چینایەتی و ئینسانی و ئەدەبیاتی پێشڕەو زیندوو ڕابگرێت و دەست بەو شانازی و مێژوە خۆش و ناخۆشانەوە بگرێت و خۆیشی دەکاتە خاوەنی هەموو مێژوەکە، بە باش و خراپەوە.

بەڵام خەون بە ڕوئیا و هیوابەخشی شەبەق لە شیعرەکانیدا بە ڕوونی دەبینرێت، ئەمەش ئاماژەیە بە ئیمان و باوەڕێک کە شەبەق بۆی تێکۆشاوە و باوەڕی قایمی پێیبوە و بەردەوام دەبێت.

شەبەق، وەکو کەسایەتی چەپ و سۆسیالیست، وەکو پێشمەرگە، وەکو شاعیر و ئینسان بە هەموو ژیانی خزمەتی ئینسان و شیعر و ئەدەبی کردوە، ژیانی پڕیەتی لە حیکایەتی گەورە و شیعرەکانیشی پڕن لە حیکایەتی گەورەتر، شیعر و ژیانی شەبەق ڕێکاوێک دوو دێر و یەک شیعرن، دوو ڕووی یەک ژیانی سادە و واقیعی ئینسانییە و هیچ کات سازشی لەسەر بیروباوەڕە ئینسانییەکانی نەکردوە، گەر ئینسان شەبەق لە نزیکەوە نەناسێت، بەڵام تەفسیر و تەحلیل و لێکدانەوە بۆ شیعرەکانی بکەیت، تێدەگەیت شیعر و شاعیر لە یەک زەمەن و مێژوودا لە چوارچێوەی مەسەلە ئینسانییەکان و ئەدەبی شۆڕشگێڕانە و بەرگری و چینایەتی دەسوڕێتەوە.

لە کتێبی (ژیان و ئەزمونی شیعرییم)ی ئەدۆنیسی شاعیر کە شوان ئەحمەد وەریگێڕاوە دەڵێت «هەموو ئەفراندنێک لە خۆییدا

بریتییە لە خولْقاندنی جیهانێکی تازە و شاعیری ڕاستەقینەش ئەوەیە کە جیهانێکی تایبەت بە خۆیمان پێشکەش دەکات، نەک ڕستێک دید و بۆچوون و زەخرەفە سازیمان بەردەست بخات».

شەبەق، جیهانێکی تایبەتمان پێشکەش دەکات، کە پڕیەتی لە عیشق و ئاسودەگی، پڕیەتی لە ئەفراندن و خۆڕاگری، ڕەنگە شەبەق تاقە شاعیری ڕۆژهەلاّت بێت، کە شیعری بۆ هەموو کارەسات و تراژیدییەکانی کوردستان لە هەر کام لە بەشەکانی وتوە و هەموو سیمبولْ و ڕەمزە شۆڕشگێڕییەکانی بەرز ڕاگرتوە (کارەساتی ئێزیدییەکان، شێرکۆ بێکەس، ساکینە جانسز، گەریلا، شەڕڤان، ئالانی کوردی، کۆڵبەر و ڕەنجی باشور، بۆتێ و هەورامان)، ئەم فۆڕمە شیعرییە زۆرتر لای شێرکۆ بێکەس دەبینرێت، جیا لەوە دەبێ بلّێم «حسێن شەبەق نەک هەر شاعیری هەموانە، پێشمەرگەیە، شۆڕشگێڕە، ناسک و هێمن لە چهرەی ئەو کەسانەیە کە دەور و نەقشی زۆریان بوە لە دەیەی هەشتاکان لە گۆڤاری پێشەنگ و کانونی هونەر و ئەدەبیاتی کرێکاری کوردستان»، لەبەرئەو هەموو جوانیانە بۆ ئەوەی ئەزیەت و ماندووبون و خولیا و خەون و ڕوئیاکانی شەبەق و ڕەنج و ئازار و ماندووبونەکانی نەفەوتێت، بڕیارماندا شیعرەکانی و چاوپێکەوتنەکانی و پاشان چیرۆکەکانیشی کۆبکەینەوە و کاریان لەسەر بکەین و چاپ بکرێن لە فەوتان ڕزگار بکرێن و خوێنەری کورد بزانێت هێشتا زۆر بەهرەی جاویدانی و زۆر ڕستە و وشەی جوان و ئینسانی، زۆر بەرهەمی گەورە هەن کە نەیدیتوون و بیانناسێ.

حسێن شەبەق، باشە و جوانە دەبێ بخوێندرێتەوە.

**ئەنوەر حسێن (بازگر)**
**ئەیلولی** 2020
**سلێمانی**

# نامەیەکی حسێن شەبەق
# بۆ ئەنوەر حسێن

**هاوڕێ و برام کاک ئەنوەر بازگر**

**ئەم کاتەت باش،**

دیسان ئەوە هاتمەوە لات. ئەو ماوەیە کارێکی زۆر و پڕ بە پڕم کرد بۆ ئەوەی بتوانم کۆمەڵێـک لــە شــیعرەکانم و ئەو چەند چیرۆکــەم که لەگەڵ ئەو نامەیە بە دەســتت دەگات، لە زیندانی لای خۆم و لە ڕاستیدا مەرگ نەجاتیان بدەم. بە خۆشییەوە توانیم سەرەنجام ئەو کارە بە سەرکەوتوویییەوە تەواو بکەم. ئەوی تری ئیتر دەگەڕێتەوە بۆ کار و زەحمەت و هیمەتی ئێوەی ئازیز، کە بتوانن بە دەستی خوێنەری بگەیەنن. بۆ ئەوەی کتێبەکانم ون نەبن و تێدا نەچن و لە لیستی کتێبخانەی گشتی جیهانیدا تۆمار بکرێن، حەز دەکەم کە حەتمەن شابەک و (ISBN)ی خۆیان هەبێت.
لەگــەڵ ئەوەیشــدا حەز دەکەم کە مافی لەچاپدانەوەیان واتــە ئیمتیازی لەچاپدانەوەی کتێبەکانــم بــۆ خۆم پارێــزراو بێت. بۆیە تکا دەکەم ئەم ڕســتەیە لە لاپەڕەی یەکەمی کتێبەکانم بنووسن.
مافی لە چاپدانەوەی ئەم کتێبە، بۆ نووسەرەکەی پاریزراوە.
یەکێک لە چیرۆکەکانی ئەم کتێبە، واتە چیرۆکی "ســیبلی متحرک" دەتوانێت نەک لە کوردســتان، بەڵکوو لە هەموو جیهان دەنگ بداتەوە و ئاگر بکاتەوە و پای خۆیشــم بگرێتەوە.
ئەم کتێبە ناو دەنێن : "سیبلی متحرک".
کتێبەکە لە شەش چیرۆک پێک دێت. حەز دەکەم چیرۆکەکان هەر بەم تەرتیبە کە من لە خوارەوە نووسیومە لە کتێبەکەدا جێ بگرن.

1- کیسە گەچەکان ئازار دەچێژن!
2- مامەی نەفتی
3- سەرباز
4- تۆ کمۆنیستی
5- عەلی هات
6- سیبلی متحرک

من خۆم بە سەر تێکستەکاندا چوومەوە بۆ ئەوەی هەڵەی ئیملایی و ئینشاییان ڕاست بکەمەوە. لەگەڵ ئەوەیشدا دەزانم حەتمەن هەڵەی دیکەشیان تێدایە کە من نەمدیوە و ئەوەیش ئاســاییە. هەمیشە نووســەر یان تایپیست لە ئاست هەڵە ئیملاییەکانی خۆی

کوێـرە. بۆیـە داواکارم کە خۆت یان کەسـێکی کوردیزان بەر لە چاپکردن بە سـەر تێکسـتەکاندا بچێتەوە و هەڵەکان ڕاست بکاتەوە. لەو شـوێنانە کە ویراستار نازانێت یـان ناتوانێت هەڵەیەک ڕاسـت بکاتەوە واتە گومانـی هەیە کە چی لە هەڵەکە بکات و پرسیاری بۆ دروست دەبێت، تکایە خۆم ئاگادار بکەنەوە تا گرفتەکە چارەسەر بکەین. نووسینی پێشەکییەکی کورت بۆ ئەم چیرۆکانە دەسپێرمە دەستی خۆت. کاک ئەنوەر بازگـر ئیختیـاری کاملـی هەیە کە خۆی یان ئەوەتا کەسـێکی سـەنگین و بـە توانا، پێشەکی بۆ کتێبەکە بنووسێت.

لە کەوانەدا بڵێم لە کاتی ناساندنی مندا ڕەنگە ئەم چەند دێڕە بە کەڵکتان بێت.

"نووسـەر ساڵی (2012)، (bachelor) واتە لیسانسی لە بەشی زمان و کەلتوور لە زانکۆی ڤێسـتفۆڵد لە نەرویج وەرگرتوە، پاشان ساڵونیوێکی تر ماتماتیک و زمانی لە هەمان زانکۆ خوێندوە و ئێستا مامۆستای ماتماتیکە لە بەشی ناوەندی."

دیارە بەسەرهات و چیرۆکی ڕابردووی منیش لای خۆتان و لە ناو گفتگۆکەی خۆت و خاتوو سـەمیرەدا هەیە و هەروەها ئەم گفتوگۆیەی گۆڤاری (ئەوین)یش دەتوانێت زانیاری زیاترتان بداتێ لە بارەی منەوە. گفتوگۆکەی گۆڤاری (ئەوین)م بۆ ناردووی. لە کۆتاییدا دیسان سوپاسی خەمخۆری و دڵسۆزی و هیممەت و زەحمەتەکانی تۆی هاوڕێی بەڕێز و خۆشەویستم دەکەم و لەشێکی ساخ و دڵێکی خۆش و داهاتوویەکی گەشترتان بۆ بە ئاوات دەخوازم.

فەرموو ئەمەش وێنەیەکی نە کۆن و نە تازەی من
هەر بژی بۆ برات

**ح. شەبەق**

2020-7-1

**نەرویج**

# پێشەکی نوسەر

**خوێنەری بەرێز!**

ئەوەی لە دوو توێی ئەم کتێبەدا دەیبینیت، قسەی دڵ و شەونامەی شاعیرێکی دەربەدەرە. شاعیرێک کە شەپۆلە سەرکەشەکانی دەریای دەرد و ژانی کورد لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، لە گەڵ خۆی بردوویەتی و لە گۆشەیەکی ئەورووپادا فڕێی داوە.

هەر من وانیم، تۆیش وەک من بەم دەردانەوە ژاوی و زام و ئازار دڵی پر کردووی و جارجارە لە تەنیایی و تەنگانەدا وەک من پەنات بۆ شیعر و گۆرانی، بە گشتی بو هونەر و موزیک بردوە.

کورد کەمی هەیە کە هونەرمەند و هونەردۆست نەبێت. ڕەنگە ئەوەیش لەبەر دۆخی ناهەمواری ژیانمان بێت هەموو شتێکیان لێ کردووین بە هیوا و ئارەزوو و هەموومان هەوڵمان داوە لەم پەنای شیعر و هونەردا جارجارە خۆمان لە چەنگ ئێش و ئازاری ڕۆحمان دەرباز بکەین.

هەر ئەوەندەیش نییە. کورد و جووڵانەوەی شوڕشگێڕی کورد پێویستی بە هیوا و هیممەت و جەربزە بوە بۆ ئەوەی لە کۆست و تەنگانەکاندا بە سەر کیشە و شەڕ و گرفتەکانیدا سەر بکەوێت. شیعر و سروودەکانی بەرەنگاری، شان بە شانی گوللەی تێکۆشەر و خەباتکاران لە بەرەی جەنگی کورددا، لە بەرەی خەڵکی بەشمەینەت و چەوساوەدا، شەڕیان کردوە و شاکاریان خوڵقاندوە.

شیعر و هونەری بەرەنگاری، کە ئاوێنەی باڵا نوێنی خەبات و بەرەنگاری و شۆڕشە، بە حەق دەوری سەرەکی گێڕاوە لە هیوا و ئومێد بەخشینەوە بە جووڵانەوە و دۆزی ڕەوای کورد و شاعیرانی کورد لەم بوارەدا هێندە چوونە پێش هەتا گەیشتوونەتە ئەوپەڕی لوتکەی بەرزی و زۆریان لە ڕیزی ڕابەرانی پێشڕەوی خەباتی کورددا بوون و هەن.

خوێنەری ئازیز و هاوڕێی بەڕێزم!

ئەگەر تۆ شاعیر، یان هونەرمەندێکی کوردی، ئێستا لە ناو یەکێک لە شارەکانی کوردستان دەژیت، بێ گومان دەبێت هونەرەکەت ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆت و خەون و خەیاڵی خۆت و خەڵکەکەت بێت. دەبێت بەم ژان و حەزە نوێیانەوە بژێیت و بژی، کە هەنوکە خەڵک پێوەی دەسووتێن. کۆمەڵگای کوردی ئێستا زۆر لە سەردەم و زەمانی ئێمەمانان ئاڵۆزترە و دەرد و ژانە کۆمەڵایەتییەکان دەیان قات ئاڵۆزتر و قورسترن. ئەگەر بە چاوی شیعری کووچەکانی شارەکەت، بە چاوی شیعری ئەمڕۆی سەرشەقام چاو لە شیعری کەسێکی وەک من بکەی، ڕەنگە تۆی ئازیز بە سەهوو بچی و حەزی پێ نەکەیت و منیش لە ئیمتحانی ئاخریساڵی تۆی مامۆستام دەرنەچم.

بۆیە پێویستە دووپاتی بکەمەوە، کە شیعری من وەک خۆم، وەک ژیانم، مۆرک و نیشانانەی سەرکەشی و یاخیبوون و بەرەنگاری پێوەیە. درەختێکە ڕەگی لە خەباتی گەل ڕۆچوەتە خوار و سەری لە ئاسمانی سەربەرزیدا دەشەکێتەوە.

کە سەرگوزەشتەی خۆم دەخوێنمەوە دەبینم بێ خواستی خۆم، لە خۆوە بووم بە شاعیرێکی دەربەدەر. شاعیرێکی دەربەدەر شیعرەکانیشی دەربەدەرن. نازانم بۆچی بەڵام ئێستا

وەک قەدیم نییە. لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا کەسی دەربەدەر و شیعر و شاعیری دەربەدەر زۆر خۆشەویست نین. دووری لە خەڵک، تا ڕادەیەک لە یادی بردووینەوە.  ئێستا خەڵک هەیە بۆژۆیی بە بوونمانەوە دەکەن. چەشنی زەردەی خۆری پاییز، تیشکی بەرەو ئاوابوونمان کەم تینە. خۆمان دەڵێم ها.

لە گەڵ هەموو ئەوانە چونکە لە هونەردا بە گشتی شتێک، خولیایەک، هەستێک، حەزێک، گەوهەرێک هەیە کە نەگۆڕ و گشتییە، هەر بۆیەش شیعری ئێمەمانانیش خوێنەری خۆی هەیە و دەیبێت و قەت لەبرەو ناکەوێت و لە بیر ناچێتەوە.

خۆشەویستان کورت و کرمانجی باسی ئێمە باسی خۆشەویستی و مەرگ و ئازادییە. ئەم سێ کوچکە، ئەم سێ وشە، ئەم سێ پایە، ئەم سێ سەنگە، ئەم سێ دۆخە، ئەبدین و قەت لە بن نایەن. نە باسی ئەشق و خۆشەویستی تەواوبوونی هەیە و نە لە لێدوان لە ئازادی سنوورێکی دەناسێت و نە خەبات و گیانفیدایی ئازادیخوازان بە پایان دەگات. ئێمە بووین و هەین و بێ گومانیش هەر دەبین.

ئەمە چوارەمین دەفتەری شیعرەکانی منە. ئەگەر عومر باقی بێت، دەفتەری پێنجەم و ئاخریش هەر خۆم کۆی دەکەمەوە. ئەگەریش تەمەن لە کورتیدا، هاوخەم و هاوڕێیەک هەر دەبێت، ئاخر وشەکانی من بگەیەنێتە دەستی ئێوەی خۆشەویست.

لە شیعر خۆشتر ژیان خۆیەتی. ژیان و جیهان هەر دووکیان زۆر زۆر جوان و شیرین و شازن، بەڵام هەزار داخ و مخابن کە زۆردار و چەوسێنەر و گەمژە و زەینکوێر و ستەمکار و گەندەڵ و بازرگانانی خوێنی خەڵک، ئەم جیهان و ژیانە خۆشەیان لێ کردووینە ژان و برک و بێگاری سەخت و جەهەننەم و ژەهری

مار. هەموو تاوادان و تێکۆشان و هەوڵ و هاواری ئێمە بۆ گێڕانەوەی ژیان و جیهانە بۆ دۆخە جوانەکەی خۆی.

لە بیرتان بێت، ئەگەر شیعر و شاعیر و هونەر و هونەرمەند خزمەت بەم ئەرکە گرینگە نەکەن، هونەرەکەیان کەڵەی ناو بێستان و ژەهری ناو شەکران و بژیوی خۆپەرەستانە.

هەر بژین بە سەربەرزی.

**ح. شەبەق**
**خەرمانانی 2020**
**نەرویج**

# بۆ هەواران دێمەوە

بە یادی هاورێی جەسوور و جەنگاوەر، هاورێ
تۆفیقی ئەلیاسی ناسراو بە تۆفیقی حەمە لاو

شەوی ئەنگوستەچاو دەبڕم
بەربەیانی دێمەوە
خۆ لە عیشقی شەم دەدەم
بۆ ژوانی دێمەوە،

ترپەی دڵی ئەم شۆڕشەم
شەو لە سوێیان دێمەوە
گڕ لە شەوگار بەردەدەم
بە گڕباران دێمەوە،

لە سەر لوتکەی بەرزی هیوام
ڕۆژ و شەو دەشنێمەوە
بۆ ئەوینێك سەر دەدەم
وەك هەزاران دێمەوە،

وەك هەزاران ئارەزووم
دەچمە گیانی تازەوە
دەبمە تۆی شینی بەهار
بۆ هەواران دێمەوە،

چاو بە چاوان چا دەکەم
ڕووح بە گیانان دادەکەم
وەك شەماڵی خەمڕەوێن
بۆ بێساران دێمەوە،

ڕێ بە من ڕێیە
شاخ بە ودمی من دەژی
باوەشی دەشت بۆ منە
بۆ چەمشاران دێمەوە،

سا وەرن بیگرنەوە
هەرچی ڕێگە و ڕێچەیە
سا وەرن بیسڕنەوە
هەر کوێ شوێن پێی من هەیە،

من دڵی شاری سنەم
شاخی هەورامانی چڕ
شان و باهۆی پاوەمە
مێشکی کوردستانی پڕ،

سا وەرن بیبڕنەوە
چپەی ناو مەیدانی کار
ئێعدامی کەن یەك بە یەك
دەنگ و باس و خەڵکی شار،

گڕ و ئاورینگی ڕاسانم
لە کوورە و کان و کارگا
چی لە دەریا دەکەن؟
هەمیسان هاکا تۆفان کا!

ڕێ مەدەن دەنگ بێتەدەر
ڕێ مەدەن باس بێتەوە
ڕێ مەدەن سامی شەو بشکێ
ئاوری گیان هەستێتەوە،

ڕێ مەدەن پێخوستانی شار
کۆڕ و کۆمەڵ ساز بکەن
بۆ بە هاواری یەکگری
ڕاستەقینە باس بکەن،

چیی لە تواناتان هەیە
ڕێکی خەن ئامادە و تەیار
تەك تەکی ئەم خەڵکە بگرن
بۆ بە زیندان دێ و شار

ئەو گەڕەی وا لە سەرما بوو
دێت و گەڕ دەگەڕێتەوە
شار و گوندی کوردەواری
پڕ بە پڕ دەگەڕێتەوە.

هەر قەترە خوێنێکم
ئالای بالایەکی بەرزە
هەر دڵە وا لە ڕێدایە
هەر ڕابەرە وا دێتەوە

ڕازی گەورەی سەردەمم
تا بکوترێ ئەم سەرەم
زەبری قیناوی ترە
جەنگاوەری کۆمەڵەم!

**1372 – 1993**

**زڕگوێز**

* ئەم شیعرە لە لایەن هونەرمەندان (بەکری لەگزی – لوقمان ئوەیشی) کراوە بە گۆرانی.

# بە شەپۆلان دای پۆشن
# یان بە خاکی کۆبانی

بۆ ئالان کۆبانی

کە ڕۆژی (4)، سێپتامبەری، (2015)،

شەپۆلەکانی دەریای سپی ناوەڕاست لێی ستاندین.

بە شەپۆلان دای پۆشن
یان بە زیخی کەناران
با داڵێک نەیڕفێنن
بۆ هەڵدێری دیواران

زەوی نامیهرەبانە
یان دەریای قووڵی بەرین؟
یان دڵی بەردی مرۆڤ
یەخەی کەمەیان بگرین؟

خەڵک وێنەت هەڵدەگرن
دەیکەن بە یاد و هێما
من کام یادت هەڵگرم
بیکەم بە تۆشەی ڕێما؟

سنوور بووەتە داڵێک و
چرنووکی لێ تیژ کردووین
سنوور لە ناو شارانیش
بێچوو و منداڵی بردووین

چیرۆکی تۆ نە مناڵە و
نە تازەیە و نە سەیرە
ئالان لە مێژە دنیا
ئاشنایە بەم تەیرە

بۆ کوێ دەچووی ئالان گیان
ئاسمان لێرەش هەر شینە
لێرەش یاسای دارستان
بڕیار دەدا لەم ژینە.

من پەنا بەرمە بەر کوێ
بێ بەڵگە و بێ ناسنامە
دادی تۆ بۆ کێ بەرم
گوێی کەڕە ئەم جیهانە.

نە شارم ما نە گوندێ
هەمووی تەختی زەوی بوو
دیوار بۆ من هەر بەرز و
بۆ نامەرد هەر نەوی بوو

سنوور لە ناو دڵیاندا
چواردەوری ڕێیش سنوورە
بە قەد بەرزی ئاسمان
ئازادی لێمان دوورە.

به شه‌پۆڵان دای پۆشن
یان به خاکی کۆبانی
تۆ وێژادنێکی زیندووی
ئاڵان تۆ کوردستانی.

**سێپتەمبەری (2015)**

# ئاوات و ئەفسانە*

بە یادی ئەوین و بەسەرهاتی ئاوات و ئەفسانە.

خۆشەویستی لەم دیارە، کانی خەم، ئەفسانەیە
ماڵ و مەکتەب، ڕێ و کۆڵان، جەغز و گرتووخانەیە

بەندیخانە پڕ لە دارا و پڕ لە ئاوات بوونە خۆ
تار و مارە، دیلە بۆکان تا لە دەس بێگانەیە

نایەڵن قەت خۆشەویستی بێتە بەر وەك دار و گوڵ
کوندی شوومن، چۆڵ پەرەستن، قیبلەیان ویرانەیە

گەرچی ڕۆیی، دیار نەماوە، بەندی دڵمە هەر دیار
خۆشەویستم، ڕێی خەباتم، گوڵی‌سوور، تاقانەیە

دایە گیان هەر ئێمە نیین دڵ پڕ برین دێین و دەچین
چاو بگێڕە دڵی کوردان ئاگر و گڕخانەیە

دڵ نەماوە توێ توێ نەبێ هەڵنەقرچابێ بە سۆ
مەرگی هاوبەش، وا ببینە، جێژنە پیرۆزانەیە

ماتەمێنی دامەنێ، ئەی چیای سەربەرزی ژین
تاکوو دەوری، تەوری پیلان، ڕۆژی ئەو گورگانەیە

ڕازی ئێمە دێتە درکان و دێتەوە **ئاوات** و شار
دەپارێزێ ئەم ئەوینە، ئاوەدان لەم ژانەیە

ڕاستە ئەمڕۆ ڕێی خەباتمان ئاڵۆز و پڕ تەمە
وەی بەرزەت بابە ڕووخان دایە گیان قەت ڕانەیە

وەك ڕۆمانی پر لە ژانە بێبن و كۆتاییە
چاوگێكی پڕ لە هەست و پڕ لە دەرس و وانەیە.

**2006/12/20**

* ئەم شیعرە لە لایەن هونەرمەند (خەبات قورەیشی) كراوە بە گۆرانی .

# دارتەون

پێش ئەوەی تاڵی زێرینی خۆر
پرچێکی شاخ دابهێنێ
پێش ئەوەی لە سەر لێوی گزینگ
ڕووناکایی سەر دەربێنێ،

پێش ئەوەی گوڵان بپشکوێن
بەیان چاوی بکاتەوە
پێش ئەوەی مەلان بێنە جۆش
چریکەیان دەنگ داتەوە،

پێش ئەوەی کۆڵانی دێ
لە ژاوەژاوی ژین پڕ بێ
پێش ئەوەی ترووسکاییەك
لە داری کوانووی ئاگر بێ،

پێش ئەوەی گیانی کوورە
تینی کاری تێگەرابێ
کاکەی بەکارکەوتووم
قووڕی بەیانی شێلابێ،

پێش ئەوەی منداڵانی کوورە
لە نێو خۆڵا بتلێنەوە
برینی دایکانی دەستگیراو
لە تاوانیان بکولێنەوە،

پێش ئەوەی مەیدانی کار
دڵی پڕ کا لە بێکاران
هەتاکوو دەمەو چێشتان
بزوونەوە بەرەو ماڵان،

پێش ئەوەی دەرگای کارگا
هەڵگیرابێ بۆ ڕۆژتاڵان
گەلەگورگانی ناوبازار
بیانگرێ بیری تاڵان،

پێش ئەوەی قوژبنێکی شار
پەنجەی کاری پێ گەرا بێ
تاقە کەسێک لە ئاوایی
چاوی لە خەو هەڵێنابێ،

من نیوە شەو تاریک تاریک
خەو لە چاوم بزڕکاوە
بەرەو ژووری کارگای قاڵی
بە تۆبزی ملم ناوە،

دەڕۆم تا سبەی شەوێ
لە زیندانێک حەبس کرێم
نە ڕووناکاییەک ببینم
نە لە گەڵ کەسێک بدوێم،

دەڕۆم تا بە تان و پۆی
بەن و ماشەر دەستم ڕابێ
بە تەمای ڕۆژێک ببمە وەستا
چاوم لێڵ و پشتم دابێ،

دەڕۆم هەتا بە بۆنی شێ
هەموو گیانم خاو بێتەوە
**12** ساعەت! **14** ساعەت! **16** ساعەت
نازانم کەی دەبڕێتەوە!

من نیوە شەو تاریک تاریک
خەو لە چاوم بزڕکاوە
دارتەونم کردوەتە ئاوێنە و
لە ڕووبەڕووی خۆم داناوە.

لەبەر سەرما هەڵدەلەرزم
پرچەکانی دەهۆنمەوە
کێ دەزانێ کام چارەنووس
ئەمڕۆ و سبەی بەدوومەوە،

بۆنی ڕەنگ و بۆنی شێ
ژووری شێداری پڕ کردووم
هەوێنی سەرمای نیوەشەو
سەرپەنجەکانی سڕ کردووم،

دەچنم، دەچنم، دەبڕم دەبڕم
لەم نیوەشەو تا ئەو نیوە
بەقەدرایی دوو سەعاتێک
ڕۆژی ڕووناکم نەدیوە،

من نیوەشەو تاریک تاریک
خەویان لە چاو دزیومەوە
لە شەوگاری ئەم ژیانەم
ڕووناکایان سڕیومەوە،

لەم ژێرزەمینە شێدارە
هەموو ژیانم دار و تەونە
جیا لە تانی بەن و کەلاف
هەموو شتێکم لا خەونە.

لە نێو بەندا دەئاڵۆزێم
وەکوو ئەوان دڵ پڕ گرێ
بە دەم گرێ لێدانەوە
هەزار خەیاڵ هەڵم دەگرێ.

ئەم قاڵییەی من دەیچنم
زیاتر لە خۆم عومر دەکا
قەدری دەچێتە سەرچاوان
زۆر سنووران تێپەر دەکا.

ئەی ئەوانەی ئەمڕۆ و سبەی
گوێ لە ڕازی ئێمە دەگرن
گۆرانییەکانمان دەبیسنەوە
قین لەم دنیایە هەڵدەگرن.

لە گەڵ هەر گرێیەك ئێمە
بیرێکیشمان گرێ داوە
قاڵییەکی هەزار ڕەنگە و
لە ناو دڵمان چندراوە.

**بەهاری 1370 ـ 1989**

# هەستی راساو*

بۆ ئیحسان فەتاحیان،

کە ڕۆژی (11)ی نوڤێمبەری (2009) ئێعدام کرا.

هەستی راساوی ئەم گەلەی، ئارەزووی بووژانەوەی
ئەشق و شووری ئاگرینی سەردەمی هەستانەوەی

مەرگی سوورت ژینی تازەیدا بە گیانی سەنگەران
بەرخۆدانت مەشخەڵێکەوا بەدەس تێکۆشەران

تۆ بەزاندت ئەو سنوورەی دوژمنی دڵرەش تەنی
وەك سروودی سەروەریمان، دەنگی ئازای سەردەمی

تۆ حیاسەی خۆشەویستی، پڕ پەیامی باوەڕی
ئاوەدانی ڕێی خەباتی، جەربەزەی جەنگاوەری

شۆڕشێکی گەرمە ناوت، دڵنیامە هەڵدەکەی
چەشنی بوورکان سەردەکێشی، گڕ لە دوژمن بەردەدەی.

ئەی نەسیمی نەوبەهاری دۆخی ژینم، هەڵکە دەی
هەڵکە مۆژدەی ڕۆژهەڵاتی یەکبوونەوەم هەڵکە دەی

**نوامبری 2009**

* ئەم شیعرە لە لایەن هونەرمەند (چیا مەدەنی – بەکر لەگزی) کراوە بە گۆرانی.

# یادێك لە «بـــــــــۆتێ»
# بۆتێ ی كۆمەڵەكان

ئەم بابەتە (32) ساڵ بەر لە ئێستا نووسراوە.

لە ئێوارەیەكی هـەواكـەش و سافی بەهـاریدا، گـەواڵە هـەوری ئـەرخـەوانـی خاڵخاڵ سـوور و سپی، هێورهێور بـە سـەر شـاخ و دۆڵەكاندا تێ دەپەڕین.

پیرە دارە پەڵكەكان تازە لق و پۆیان خوێنی شینی بەهاری تێ دەگەڕا و چڕ و چڵیان ئاڵەسەوز دەبوون.

جریوە و چریكەی چـووڕە و چۆلەكە ئازاكان ئەو ناوەیان پڕ كردبوو، كێشەوكێشەوەی پووشیان بوو. تازە خەریك بوون هێلانە و ماڵیان چیلكە و چێ دەكرد.

ئەویندارانی باخی ژین، تازە خەریك بوون گوڵ و شكۆفەی دڵیان بۆ باڵداری سرك و نەوەستی خۆشەویستی دەكردەوە.

لە قەراخ ڕێگە زیخڕێژ و ڕێچكە بەردەڵانیەكانی سەر چەم و كانی، دوودوو و چەندچەند، مەلی دەنووك سووری ئازادی تازە هەوای بنباڵیان دەدا.

ئێوارە بوو، كیژی خۆرهەتاو تازە بە تازە خەریك بوو پرچە خاوەكانی لە بەردەم ئاوینەی چەمدا شانە بكات.

بولبولێكی ئاشق و مەست لە سوێی گوڵی پـاوان، تازەبەتازە خەریك بوو گەرووی بۆ چریكەیەكی ئاگرین و سێحراویی نوێ ئامادە بكاتەوە.

چركەی زەمان زەنگی ڕۆژی (25)ی، گوڵانی (1988)ی بە گوێی هەموو زیندەوەرانی دۆڵی بۆتێ ڕاگەیاندبوو،

ئێوارە بوو، لە پڕ هەموو نازی بەهار و سەوزایی باخ و ژوان و دڵداری گوڵان و چریکەی بولبولان و سۆزی ئاشقانی ئازادی تێکئاڵۆزکا و شێوا.

لە پڕ ئاسمان تاریک داهات. شاخ پارچەپارچە بە سەر دەرە و دۆڵ و چەم و دارەکاندا ڕووخان. شریخەی فڕۆکە شەڕکەرەکان، گرمەی و گەردەلوولی ناپاڵم و پڕانی تۆزی سیانور و خەردەل و سارین ئەم ناوەیان تار و مار کرد و هەموو شتێک لەبەریەک ترازا.

ئەم شیعرە، بانگاوازی سووری ئەم ئێوارەیەی دۆڵی "بۆتێ"یە. ئەم وشە سوورانە تۆزێک لە تۆزی هاواری ئەم دەوارە وێرانەی کۆمەڵەیە.

لێی گەڕێن با شنە و پشووی سەوز و عەتراوی بەهار لە گەڵ خۆی بیبا و هەموو ساڵێ بە گوێی ئاشقانی ڕێگای ئازادی بگەیەنێت.

با ئەم یادە قەت تۆزی خەم لێ نەنیشێت، تێپەرینی زەمان غروری نەشکێنێت، زریانی فەرامۆشی زولفی نەشەمزێنێت و دیواری کارۆخ نەیوەستێنێت.

# بانگەوازی سوور

یاران یارانی وەفاداری من
گوڵاڵە سوورەی نەوبەهاری من
چەپکە گوڵی بوون لە باخی ژیان
بە دەستی زریان پەرپەڕ هەڵوەران

لەم ناوە ئیتر بەهار خەزانە
گژە بای تووڕە و گەڵا ڕێزانە
بولبول لە باخان لە پای گوڵ کەوتوون
مەلی بەهاری لە چریکە کەوتوون

گەڵا زەرد، گوڵ زەرد، دار و دەون زەرد
سەراسەر دەشت و باخ و چەمەن زەرد
گەڵای دارەکان وەك ئێوە وەرین
شکۆفە پەرپەڕ فەرشی سەر زەوین

چاو لە هەر کوێ دەکەم زەردی خەزانە
ماڵمان کپ و چۆڵ « بۆتێ» وێرانە
لە گەڵ کۆچی سوور نەوبەهاریش چوو
ئەی هاوار هاوار! ئەم کۆچە چی بوو؟

یاران یارانی ئەوینداری من
گوڵاڵە سوورەی نەوبەهاری من
سەدان گوڵ و باخ لە داخیان دەگرین
سەرشینە یەکسەر سابڵاخی خوێنین

ئیـــــــلام و سنـــه و مهـــابــــادەکـەم
هـەولێـــری هێـــدی و کۆن ئابادەکـەم
زیاتـر لـە هـەر جــێ ئـەمــڕۆکـە ئێــوە
تـەمـی مـەینـەتتان باری ســەر لێـــــوە

بەدوای کـــــۆچــــەوەمــــەبـــــادا بگـــرین
دەردی بێکـەسـیم بشــــۆن بە ئەسـرین
کـەسـی مـن ئـەوەن سـەربـەرز و ڕووسـوور
لـە ئاسـت دوژمـنـــان وریـــان و جـــەسـوور

دەبـــێ گـریـانـمـان بکـەین بــە هــاوار
هاوارمـان بـۆ جـەنگ لـە مـەیدانی شـار
با پێچ دا و هـەڵچـێ ئەم دەریــای ژانە
بیکـا بە تــــۆفان ئــەم شـــــەپــۆلانــە

تـــا دوور و نـــزیك تـــێ بــگــەن لـــێمــــان
گـورگـانی وەحشـی چـی دەکـــەن پێمان
بانگــــاوازی ســـــوور دەنگ دەداتــەوە
هـێـــــــــــزی ڕزگــــاریـم کـــۆ دەکاتەوە

مــن و یــــــارانـــی زۆر وشـیــــاری مـن
تووشـتـرین بــواری ئـەم ڕێـیـەش دەبــرین
کـــــــاروانی خـــەبات بــێوچــان دەڕوا
سـەرەنجام سـەربـەرز بە مـەقسـەد ئەگا

بە دوای کۆچەوە ئێمەیش بەڕێوەین
ڕێبواری ڕێگا سوورەکەی ئێوەین
لە گیانی دوژمن هەروەکوو ئاگر
پەنجە دەکەیشین لە چیای باگر

عەهد و پەیمانە هەتاکوو مابین
بە گیان و بە دڵ لەم ڕێیەدا بین
سەربەرزی ئێوە پەرەی دەستێنێ
دنیایەك دەرسی وشیاری دێنێ

ئازیزان هاوار! سووتا هەناوم
لە ئێوە زیاتر تارە بەرچاوم
تاسەی دووریتان لە دڵ ناڕەوێ
مەجنوونی ئێوەم لەیلاکەم ئەوێ

دەڕۆم شار بە شار دەنگم هەڵدێنم
هەژاری کۆمەڵ لە خەو هەستێنم
پشت و قەڵاکەی ڕۆژی مەیدانم
تۆڵە ئەستێنم ئەوان دەزانم

دەچمە ناو خوێنی دەماری شاران
دەچمە ناو کۆڕی ڕووت و بێکاران
بە چرپە و هاوار ئەیان دوێنم
هێزی نووستووی خۆم وەخەبەر دێنم

تا دەریا پۆنگ بداتەوە
هێزی هەستاوم ڕێ بکاتەوە
تۆفان بە لرفە بڕواتە پێشێ
خاشەی زۆرداری لە بن دەرکێشێ

کوردستانی مە دەریایەك هەژار
«باستیل»ی گەورەی چینی کرێکار
کۆت و زنجیران لە پێ دەپسێنێ
پڕبەگەرووی خۆی دەنگی هەڵدێنێ

یاران یارانی وەفاداری من
ڕووناکی ڕێگای شەوی تاری من
چیرۆکی ژیانتان دەنگ ئەداتەوە
هێزی ڕزگاریم کۆ دەکاتەوە.

لە هۆنراوەکەدا ناوی سابڵاخ و سنە و هەولێر و ئیلام هاتوە. هۆیەکەی ئەوەیە کە لە ڕیزی ئەو هاوڕێیانەی لەم بۆمبارانەدا گیانیان بەخت کرد، هاوڕێی مهابادی (سابڵاخی)، سنەیی، هەولێری و ئیلامی تێدا بوو. هاوڕێیەکی زۆر شیرین و ئازا و زیرەکەم هەبوو، لە گوردانی (24)ی مهاباد، ناوی ئەحمەد هەولێری بوو، لە یەکێتییەوە هاتبوە ناو کۆمەڵە، یادی بەخێر لەوێ گیانی بەخت کرد. بە قەد هەر دووچاوم خۆشم دەویست.

# به یادی دایە حوسنی*

دایکی سێ گیانبەختکردووی سەربەرزمان،
کاک سولیمان، قاسم و زارا دانشفر
پێشکەشە بە هەموو دایکانی جەرگ سووتاوی کوردستان

لـــــە دوای بـــۆنی گـــوڵی ســـــوورت گـــــەڕابـــووی
بـــــەهـــــەڵـــدیـــــروتـــەلانـــانهـــەڵـگـــەرابـــووی

چـــــۆم و بــاخ و بـــــەنــدەن و دەشـتـت بـــــــڕین
ئـــــازاری دنـــیـــات بـە گـیـــان و دڵ کـــــــــــــڕین

چـــــەندبەچــــەند بەندینخــــانەت کـــردنە هــــاوڕێ
هـــــەواڵێکــــی ئــــــازیـــــزانی بەڵــکەلــــێ بێ

ئـــــەی چیــای ئــــاگـــرینــی ســـــــەربـەرز و سـپـی
پــــــەیـــکـــــەری خـــــۆڕاگـــــری وەك چـی دەچـی؟

لـــــە تـــــۆ فـێـــــر بێ دەبـــێ هیـــوا و سـەبووری
ئـــــەوەی وەك مـــــــە کـــــەوتە بەرژانــــــی دووری

هـــــەنــــاومــــانـــــی دایــــە گـیـــان تــا بـمێنین
گـــوڵـــی هـــیـــوای شـــەهـــیـــدانـــمــان دەچـێـنـیـن.

* ئەم شیعرە لە لایەن هونەرمەند (بەکر لەگزی) کراوە بە گۆرانی.

# شەونامەی تەنیایی (بۆ دایکم)

یەکەمین وشەم باناوی تۆبێ
یەکەمین قیبلەم باچاوی تۆبێ

چەن خۆشە وشەی دایە دایەگیان
شیرینتر لە گیان دێتە سەر زمان

چەن جوانە ناوت ئەڵماسی پاکە
لە هەموو گەرد و غوبارێ پاکە

ساوای ناو لانك کە پشکوت زاری
دا، دا ،دایەیەك دەکاتە دیاری

لە خۆشەویستی و بزەی چاوی تۆ
پڕ بە دڵی تورت، دێنێ ناوی تۆ

یەکەمین وشەم هەر ناوی تۆیە
یەکەمین قیبلەم هەر چاوی تۆیە

چەند بیرت دەکەم غەریب و حەزین
وێنەی جوانی تۆم لە دڵدا دەژین

بۆنت لە دڵما پونگ دەخواتەوە
تا کات و ناکات تۆم بیر خاتەوە

ئەوێستاش من هەر مناڵ و ساوام
باوەشی گەرمت یەکەمین داوام.

# بۆ کۆچی دایکم

وەك دارێکـی بـی ئاو
کـە سـاڵها بە تەنیا لـە بیابانـێ
چاوەڕێـێ هاتنـی ڕێژنە بارانـێ مابـێ
چاوەڕێـێ قومـێ دیداری تۆ بووم دایە،
ئای کـە ئەم ئازارە چەندە سـەختـە،
ئەم خـەمـە چـەندە قورسـە،
ئەم دڵـەم بۆ دەرنایە.

**2020/3/26**

**نەرویج**

# بۆ گەریلا،
# بۆ پارێزەرانی ڕووناکی و هیوا

پێکەنینتان گوللەیە جەرگی دوژمن دادڕە
کوانووی گەرمی خەبات و پەنجە پەنجەی ئاگرە

گەمەی مەرگە وا لە مەیدان بەزین پیاوانی پووت
ئەتۆ هاتی و شۆڕشی جیهانی کوردی بزووت

لە شەرما تواوەوە گەرچی تا هەم پێشمەرگەمە
سەد هەزار جار فیدای بزەی تۆ بم هێشتا کەمە

خەندەکەت زانکۆیەکە لێی دەخوێنین بەرخودان
خوێندکارانی ڕێگەکەت پڕدەکەن ڕۆژێ جیهان

**ئوکتوبری 2014**

**نەرویج**

# بە تەنیا بە جێم بێڵن!

بۆ باکووری بریندار

بە تەنیا بە جێم بێڵن
داگیرکەرانی بەدکار
مناڵی سەرلانکەشم
لە دەستتان بووە بێزار

بە تەنیا بە جێم بێڵن
بە بێ ئێوە دەتوانم
گەلێك باشتر لە ئێستا
بەڕێی بکەم ژیانم

بە تەنیا بە جێم بێڵن
تاریکبینانی سەردەم
بە بێ ژەهری ڕوانگەتان
ڕوونتر لە دنیا دەگەم.

بە تەنیا بە جێم بێڵن
با نەچمەوە دارستان
دیمۆکراسی و نەزمی نوێ
پیرۆزی باڵای خۆتان

بە تەنیا بە جێم بێڵن
برینەکانم زۆرن
خوێنی بە ناحەق ڕژاو
لە جۆگەی شارم شۆڕن!

بە تەنیا بە جێم بێڵن
جەرگم هەلاهەلایە
ئیتر خۆشم وەك مرۆڤ
دەنگ و هاوارم نایە.

بە تەنیا بە جێم بێڵن
بەسە زۆرداری و ستەم
مێشکم هەڵناگرێ چیتر
بە مرۆڤ بانگتان بکەم

بە تەنیا بە جێم بێڵن
شەڕی جیهانیم ناوێ
دەست لە سەرم هەڵگرن
با ئارام بگرم تاوێ

بە تەنیا بە جێم بێڵن
حەز ناکەم بە زۆرداری
حەز ناکەم بە چەك و خوێن
حەز ناکەم بە دینداری

بە تەنیا بە جێم بێڵن
حەزم لە ئاشتی و ژینە
لە ئازاد بوونی مرۆڤ
بێزم لە سەربڕینە

بە تەنیا بە جێم بێڵن
با دراوسێ بێن ئەم جار
بچنە دەرێ لە وڵاتم
داگیرکەرانی زۆردار

بە تەنیا بە جێم بێڵن
مەمکەن بە بۆمبی ئەتۆم!
بڵاو بم لە دەروندا
سەری هەمووتان دەخۆم.

**2015/12/23**

**نەرویج**

# بۆ بزەی کچە گەریلا

پێکەنینت ڕۆژی ڕوونە شۆڕشی گەشخانەیە
بەرخۆدانت موسیقایە سیحرێکی کوردانەیە

کام چیایە تەمتوومانە بەرزێکەی ئاسمانگرە
لە ژێر پاتا گۆڕەپانە ڕێکی ئەو دەشتانەیە

سەردەمێکە چاو دەگێڕم ببینم شاجوانێ
نەمدەزانی لە کۆبانی دێتەدەر ئەم تاقانەیە

ئەی بە قوربانی ناوەکەت بم گریلا شاجوانەکەم
چاوی من ڕوون بە دیداری شێری ئەو چاوانەیە

چەند ئازیزە دێتە گوێم تاوبەتاو نازناوەکەت
سەری دوژمن لە بن پێتا پەست و گۆی تۆپانەیە

باغی هیوام دێتەبەر، دێ، دێتەوە هێلانەکەی
ئەو مەلەی زۆرزۆر لەمێژە یاغی بوە لەم لانەیە

پێکەنە دەی، هەر بزەی تۆ، تیری جەنگە لەم شەڕە
ئەم چەکەت ڕووخێنەری لەشکری بێگانەیە

**2014/10/12**

**نەرویج**

# بۆ سەکینە جانسس

لێـــره بگـرن گـەڕی شـایی بـــووکـی سـوورم هاتەوه
شـکـۆی شـاخ و شـار و شـۆڕشـگـێڕی سـوورم هاتەوه
هەر لە باکـــووری خـــۆینەوه تاکـــوو پاریسـی کـــۆچ
هەسـتنە سـەرپێ گـریلای کـوردی ڕووسـووورم هاتەوه.

بێن گـوڵـی یادی بە سـەر ئاسـمانی وڵات دابکـەن
بۆنـی هیـوای بە سـەر چـیـاکـان و ڕێی خـەبات دابکـەن
بـۆ مـناڵانی بـاس بـکـەن دایـکـان، بـەرخـۆدانـی
خـەونەکـانی بـە پـاوانـی رۆخـی فـرات دابـکـەن.

**زستانی 2013**

# بۆ شای وشەی کوردی

بۆ شێرکۆ بێکەس

مردن چنگی ناگاتە باڵای بەرزت،
تکایە ئارام بەوە،
وەك مرۆڤی ئەم سەردەمە
خێرا مەڕۆ، پەلەی مەکە.

ئەی چاوەی ئەشق و دڵداری،
پەلەی چیتە؟ بۆ کەوتوویە تاڵووکە؟
هەموو ژیانت لێواولێوی شانازییە،
وڵاتێك بە قەد دنیا لە دەروونتا پشکوتوە،
تۆ خۆری خۆشەویستیت هەڵکردوە،
کەی مردن  ڕێی بە لای دڵی تۆدا هەیە؟

لە ڕۆژهەڵات تا ڕۆژئاوا،
لە ئێستاو تا دنیا ماوە،
بە چواردەوری گۆی زەویدا
تا ئاشقێک لە ڕێی ئەشقیدا بێ،
تا خەباتکارێك لە دایك بێ،
هەتا ڕاستی هەبێ و پێ بگرێ،
تا دڵۆپێك شیری خۆشەویستی،
لە گۆی مەمکی دایکێك هەڵچۆڕێ،
هێندەی ئیقیانووسی ڕێی شیری
مردن لە تۆ دوورە،

تۆ هەر دەژی.
ئەی شای وشەی کوردی،
باڵای دەنگت لە سەدەکان تێ دەپەڕێ،
بە قەد ئەستێرەکان بەرز دەبێ،
دڵنیامە،
تۆ هەتایی، تۆ هەر دەبی.
وەکوو دانتە، چەشنی لۆرکا، چوون شکسپیر
هەموو ڕۆژێ، هەموو دەمێ
لە یاد دەبی، گەورە دەبی.
تۆ ئەبەدی، تۆ هەر دەبی.

# بێ دەنگی ژووری مەرگە

ئەم شیعرە بۆ گیانی پاک و نەسرەوتووی بۆ (فەرزاد کمانگر، عەلی حیدریان، شیرین علم هولی، فەرهاد وکیلی و مەهدی) نووسراوە و لە کۆڕی یادی ئەو ئازیزانە لە ئوسلۆ خوێندومەتەوە.

من نەهاتووم لێرە ئەوە بڵێم کە
ئێوە سکلی سووری بەرخۆدان بوون و
ئێمە سبەی هەر هەموومان
مەشخەڵی ئازادیتان پێ هەڵدەکەین.
نا، من نەهاتووم لێرە ئەوە بڵێم.

من نەهاتووم لێرە ئەوە بڵێم.
ئێوەی جەستە ئازار دیتوو
سەری بەرز، بەرز ڕاگرتوو
قەڵای وەرەی نەبەزیوی نەسرەوتوون
وەك چۆن گیا لە سەر پنجی خۆی دەڕوێ،
ئێوە گوڵی ڕەگی گەلێکی نەسرەوتوون.
نا من نەهاتووم لێرە ئەوە بڵێم.

من نەهاتووم لێرە ئەوە بڵێم.
لە شەوی بەختی تار و تنووکی کوردستانا
ئێوە چۆڵە چرای دەستی دڵێکی بە خەبەر بوون
دوژمن لە ئێمە زووتر زانی
ئێوە ڕووناکی بوون، چرای ژووری سەر بوون.

نا، من نەهاتووم لێرە ئەوە بڵێم.
من نەهاتووم لێرە ئەوە بڵێم کە
ئاخرین هەواڵی ئێوە
بۆتە بزمار، بۆتە بەرق و تیر و شەللاق
هەر هومووومانی وەك مۆتەکە
بە ئەرز و ئاسمانەوە
وشك وشك کردوە،
دوژمنی گەش و  شاد و
 دۆستانی تاساندوە.
نا، من نەهاتووم لێرە ئەوە بڵێم.

من نەهاتووم لێرە ئەوەش بڵێم، کە
ئێوە دەستی هەستی وشیاری بوون
خەوی میللەتێکتان زڕان
خەوی قورسی بەربەیانتان لێ حەرام کردن
هێناتانە سەر گڕ و کڵپە و هەستی هەستان
من نەهاتووم لێرە ئەوە بڵێم. نا
من نەهاتووم لێرە ئەوە بڵێم.

من هاتووم ئەوە بڵێم کە
بۆنی پەیامی چوونە سەر دار چۆنە،
کە دوژمنمان هەر هەمان دوژمنی کۆن و
خاوەنی هەر هەمان کارنامە و خوێنە،
ئێمەش هەر هەمان خەڵکە سادەکەی جاران

من هاتووم لێره ئەوه بڵیم کە
جیهان گوێی خۆی لە دەردی ئێمە ئاخنیوه،
لە گەمەی نەوت و گاز و بۆمب و سازا
لە بازاڕی سیاسەتوانانی درۆ بازا
مافی مرۆڤ، بەشەر هەمووی بە پانەوه
پێخوست و پەست و وست بوه.
بێجگە لە خۆم کەس بە کەسی من ناشێ
بێجگە لە خۆم کەس بە دەردی من ناژێ
بێجگە لە خۆم کەس منی پێ ڕەها نابێ

ئەوه بوو فەرزاد ویستی پێمان بڵێ
ئەوه بوو مەهدی و عەلی ویستان
ئەوه بوو شیرین و فەرهاد کردیان.

من هاتووم لێره ئەوه بڵێم کە
لە سەر دنیا میللەتێك هەن
پەت لە سەر مل
چەقۆ لە سەر پشت،
لوولەی تفەنگ لە سەر سینگیان
بێ دەنگ بێ دەنگ
لە درِندە بکوژەکانی خۆیان ڕادەمێنن.
کاتێ هەڵاوەسران
کاتێ پشتیان بە خەنجەر دادرِا
کاتێ دابێژ دابێژ سینگیان بە گوللە دابێژرا،
ئەوسا ڕائەچڵەکێن
ئەوسا دێنە دەنگ و دێنە زەنگ و هەژان!!!!

ئەوە بوو فەرزاد ویستی پێمان بڵێ
فەرزاد ویستی بڵێ:
بێ دەنگی ژووری مەرگە
با شەقلی مەرگ بشکێنین
کە کۆیلەتی خۆدی مەرگە
با واز لە کۆیلەتی بێنین
کە سەرداخستن سەری مەرگە
با سەر بەرز کەین دەنگ هەڵێنین.
من هاتووم لێرە ئەوە بڵێم

من هاتووم لێرە بەس ئەوە بڵێم
وەرن با چی تر پێمان نەڵین:
لە جیهان میللەتێك هەن
دەرس لە مێژوو وەرناگرن
دەس لە کۆیلەتی هەڵناگرن
زیندووەکان لە بیر دەکەن
بە مردەکان دەڵێن زیندوون.
فەرزاد بە نامەکانی
بە پەیام و وانەکانی
ویستی تەنها ئەوە بڵێ
دەنگ هەڵبرە
سەرهەڵبرە
ڕاپەڕە!

**2010/5/12**

# تابلۆی ئەشقێکی زیندوو*

پێشکەش بە هاوڕێیانی ئازیزم
کە لە بۆمبارانە شیمایییەکانی بۆتێ دا گیانیان بەخت کرد.

لە شوێن بۆمبەکەی پار
ئەم بەهارەش،
چەپك چەپك،
گوڵە وەنەوشەکان،
شین بـــوونەوە.
ئەم بەهارەش،
لە بەرچاوم،
داربەڕووەکان،
پەڵکەکانی قەراخ ڕووبار،
لەشی پڕ برینی ئیشکبوویان،
پـــــــــڕئـــاو بـــــــــوەوە.
لە جێ پەنجەی،
ڕەنگپەڕیوی
هەڵوەریوی
پار بەهارا،
نەمامی نوێ،
چرۆی تازە،
گڵۆپی تورت،
ڕوان و ڕێگە شین بوەوە.

بەڵام ئیوە ئازیزانم،
ئێوە هاوڕێیانم،
بەهاری پار،
زەرد بوو لە چاوانوو.

خـــەزانی درِ،
ڕەشـــــەبا بـــوو،
هەڵی کردە سەر ڕەگی ژیانوو.

من چاوەڕێم دیسانەوە،
زوڵفی جـــــوانـــوو،
بسـکـەکـانـــــوو،
شنەی بەهار،
دای بهێنێ.

من چاوەڕێم دیسانەوە،
گـــۆفـتـی خـــۆش و
نەغـــمەکـانـــوو،
دڵی تینووی شادمانیم،
بـــلاوێـــنـــێ.
من چاوەرێم دیسانەوە،
ئـــــەستـێـــــرەتـــان،
بــــریسکەی بـــێ و
بە هیواوە بماندوێنێ.
من چاوەرێم،

وەك وەنەوشە،
سەر لەم خاكە،
دەربێنەوە.
ئەم بەهارەش،
پڕ بە هەستم،
بۆنی خۆشی هەناسەو كەم.

دیسان بە دواتانا،
لە باریكە ڕێی،
ئەم كێوەدا،
بێم و بچم،
تێرتێر،
چێژی هەستی،
دینی دووبارە كەم.

من نازانم، باوەڕ ناكەم،
ئیتر هەرگیز ئێوە نەبینمەوە.
دێم و دێم و بە ڕوانینم،
لێرە و لەوێ، لە پێچاو پێچی ئەم دۆڵانە،
لە سەر ڕێگەی قەراخ ڕووبار،
لە ئەستێرك و لێوی جۆبار،
لە گوێی ماڵە نایلوێنەكان،
لە سەر كانی،
لە بن چەتری پیرە دار و

لە سەر سەکۆ و هەڵدێرەکانی بەردەڵانی سەوزەڵانی،
لە گەڵتانم،
دەتانبینم،
بە تاسەی دڵ،
بە ڕوانینم.

لە ناو چاوتان من دەڕوانم لەم دنیایە،
پڕواوپڕی دڵی کەیل و هەست و گیانم،
وەکوو ئێوەم،
ڕازی ئەشقی پیرۆزتانم لە دڵ دایە.
چاوتان وا لە چاومدا ئازیزانم،
بۆنی هەناسەو دێ وەکوو بەهار،
دڵتان لە ناو دڵما هاوڕێیانم،
خۆشەویستی ئێوە خوێنە لە ڕەگمایە.
ئێوە هەستن، بیرن، ئارەزوون،
پەیکەری پاکی نەسرەوتوون،
ئەشقی زیندوون.

شکۆی ژینی پڕ بەهارن،
ئێوە ڕەمزی خۆشەویستین،
بەرزترینی تابلۆی قارەمانی و
دڵ و بیری وەفادارن.

غرووری سەرکەشی چیا و لوتکەکان وا لە پاتان،

لە بـــەهـــاران دڵـــرفـێـنـتـر بـــوو، بـــەزم و ســـەفـاتـان.

ئێوە بەستەن، شیعرن، ئەوینن، داستانن،
حیماسەی ئەشقی زیندوون،
چیرۆکی سەر زمانی،
دەشت و شاخ و
گـــوڵ و بـــاخ و
لوتکەی چیا و
گیانی چەم و بەردەڵانن،
ئێوە، خۆشەویستی شار و گوند و
ماڵ بە ماڵی هەژاران و
ڕێنوێنی هاوچینان و
وزەی پـــڕ لە تاوی ناو هەناوی هاوڕێیانن.

لە هەر جێیەك،
وەك وەنەوشە و گەزیزەكان،
چەپك چەپك دەتانبینم،
بە تاسەی دڵ بە ڕوانینم.

**1989/3/21**

**بۆتێ**

* ئەم شیعرە لە لایەن (محەمەد میسرِی)ەوە كراوە بە فارسی.

# دەنگ بدەن بە ئازادی

ئەم شیعرەم بۆ یادی ئەو کۆڵبەرانە نووسیوە کە بەردەوام بە شەو و ڕۆژ لە شاخ و دۆڵەکانی کوردستانی خۆرهەڵاتدا دەکەونە بەر گوللەی داگیرکەران. (10).
سێپتەمبەری، (2017)

ئاڵاکەی دەستتان بێنن
بیخەنە سەر تابووتم
گوڵێکی سووریش بێنن
بیدەن لە سینگی ڕووتم

تا دڵی پڕ لە داخم
تۆزێ ئارام بێتەوە
با برینە سوورەکەی
بە گوڵ بڕازێتەوە

هەتا مابوو ئەو دڵە
هەرگیز نە ژیا بە شادی
بە هیوا بوو کە ڕۆژێ
ترپەی بێ بە ئازادی

گەنج و لاوانی هاوڕێم
هیوام دەسپێرم پێتان
لە شەقامان بیگێڕن
بیکەن بە ئاڵای ڕێتان

دەنگتان هەڵێنن، تا بۆ
کۆتایی بە بێدادی
هەموومان هەر کۆڵبەرین
کۆڵمان کۆڵی ئازادی

تاکەی پاسدار ڕێ بگرێ
لە شار و شاخ و دۆڵان
لە پێناوی نانی شەو
بماندانە بەر گوللان

ئەم زووڵمە تاکەی لاوان
خوێنمان جۆگەی بەستووە
تەرمی بۆ گیانی برا
لە کام ڕێ نەکەوتووە؟

جەستەی بۆ گیانم بێنن
لە سەر دەستتان بیگێڕن
پەیامی دڵی سوورم
بۆ کوردستان بنێرن

بۆ خەبات و بەرخۆدان
وەدی نایە ئازادی
وەرنە سەر شەقام هاوڕێم
دەنگ بدەن بە ئازادی.

# دڵ چیـــا

(بۆ کچە شەڕوانێکی کورد)

دڵ چیا بووی و وەك چیـــا تـــــۆ مایەوە
بە جێیان هێشتی و تـــەنیا تــۆ مایەوە

لـــــە ئارارات تا «قــەڵای قەیـران»ی کـــــورد
ئەشـقـی ڕێگاتن کـــــورە حـــەیرانی کـــــورد

چ ئەشـقـێکـە بەڕاسـت تـــۆی کـردوەتە شـێر
لــــــە بەرپێتا ســـــــەرنەوین ئـازا و بـــوێـــــر

کـــوا وەلـی تاکـوو ببینـێ ئـــــــەم «شـەم»ە
کە بـــــڕیاری دەگـــــــۆڕێ ئـەم ســــەردمـــە.

**2019/1/5**

**نەرویج**

# مردوە یان ماوە؟

بۆ کچانی ئێزیدی و بۆ ئەو شەرڤانانەی، کە بە تەنیا
چوونە شەڕی دڕندەکان و «پیاوەکان» جێیان هێشتن.

ئێستا لە ناو جەنگەڵەی دڕندەکان
گەلەی کەمتیار و گورگ و ماران
لێی چوونە پێش دەوریان داوە
ئەو کچە ئازا و تەنیایەی
سەدان هەزار پیاوی کورد
کە خۆیان زۆر پێ پیاوە
بە تەنیا جێیان هێڵاوە.

ئەو پیاوانەی خۆیان
زۆر پێ کوردە
زۆر پێ پیاوە
هەر ئەوانەی
بەردی پاراستنی نامووسی کچەکانیان
سەد هەزار جار لە سینگ داوە
هەر ئەوانەی خوێنی ڕۆڵەکانیان
لە دەستی خۆیان چۆڕاوە
ئێستا دڵیان لێواولێوی ترسە و
سەرشۆڕ سەرشۆڕ
کچی خۆیان

لە دارستانی وەحشییەکان
لە گەمارۆی دڕندەکان
بە تەنیا جێ هێڵاوە.

لە دوورەوە
لەو دیو سنوورەوە
بە ترسەوە لێی دەڕوانن،
لە بێگانان دەپرسن
کە ئایا
کچەکەیان
مردوە یان ماوە.

# چاوی بیرت ناخەیتە کار؟

بۆ مەرگی شێرکۆ و حەبیب و ڕەزا و ئەوانەی لەم دوو
حەوتوویەدا، لە دار دران.

هیچ وشـەیەك نابینمەوە
ئەو ئاگـرە بوەسـتێنـێ
دەروونـی کـردمـە کـۆی زووخـاو.

هیچ وشـەیەك نابینمەوە
وەکـوو پرسـە پێشـکـەشـی کـەم
بە دایـکـێکـی جـەرگ سـووتــاو.

هیچ وشـەیەك نابینمەوە
بۆ دڵدانـەوەی باوکـی
باوکـی هیوا و ئومێد ڕووخــــاو.

هیچ وشـەیەك نابینمەوە
بۆ تۆ برای شـەهید، بـــرای
بیر چەق بەسـتووی دامـــــاو.

هیچ وشـەیەك نابینمەوە
بۆ تۆ هـاوڕێی شـەهید، هاوڕێی
لـە زەلکـاوی حـیزب گـــلاو.

هیچ وشـەیەك نابینمەوە
بۆ هاوسـەری، دەسـگـیرانـی
بۆ زارۆکـی بە کـوڵ گـریـــــاو.

تەنیا یەك وشـە شـك دەبەم
بۆخـۆم، بۆ تۆ، بۆ ئەو، بۆ ئەم
بیکـەم بە خـوێن و لـە دڵـی کـەم.

ڕوو لـە داگـیرکـەر هەرچـی بکـەی
پەنا بۆ هـەر هەسـتێك ببەی
هـــــەر وشـەیەك بە کـار ببەی،

ئەو بەردەوام بە بێ هەڵە
هەر یەك شـتـی بە بیـردا دێ
یــا بتـــگـرێ، یــا بتـکـــوژێ.

لـە نێـــوانی تۆ و ئـــــەودا
تەنیا یەك وشــــە بـــڕ دەکا
تاکـەی مێشـکـت هەڵە دەکا!

تاکـەی وەك مــــــەڕ کــۆ دەبیەوە
لـە پای داردا هــــەزار هــــەزار
تــــۆ چــــاوت نییە بیخـەیتــە کـار؟

تاکـەی دەژی بـێ سـەر، تاکـەی؟
چاو لـە بەرخـی سـەربـــڕاوت
بە چاوی‌سـەر ناکـەی، تاکـەی؟

دامـــاو، ســـــووتـاو، گـــریـــاو، ڕووخــــاو،
شــــەرم لــە بـــوونـی خـــۆت نـاکــەی؟
لـــە داگـیـــرکـەر تــــەمـــــای چاکـــەی؟

ئــــەو گــــوللەی نـــای بە دڵـتەوە
بـــۆ، بۆ ناو دڵـی بـــەرێ ناکـــــەی،
تاکـەی؟ تاکـەی جـــووڵـەی ناکـەی ؟

**14ی، خەزەڵوەری، 1392**

**5ی نوامبری 2013**

# شرۆڤەی ئەم گێژاوە چییە؟

بۆ بەهاری عەرەبی و شێوانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست

چوو، بە چاو تروكانێك ڕۆی.
چەرخی ڕۆژگارێك سووڕا!
خەڵك خۆی كەوتە پێش خۆی.
سەرلە ڕووناكبیران شێوا.

گەلان بە پڕتاوێك هاتن.
تاریكی لە گەوران داهات.
ڕابەران هەموویان ماتن.
كەس نازانێ چی ڕوو دەدات.

شۆڕش هاتوە بێ چاو و سەر.
باكووری ئەفریقای تەنی.
شۆڕشوانان شەڵاڵی خوێن،
دنیا خۆران خەنی خەنی.

لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست،
سۆنامییەك كەوتووەتە ڕێ.
تۆ بڵێی وەك خەڵك دەڵێ،
شنەی ئازادی پێوە بێ؟

خۆرئاوا پشووی دەوێ؟ یان،
پێویستێتی ئارامییەك؟
بۆچی گەلانی ئاسیا،
دەبێ بەر ببنە گیانی یەك؟

یەك هەزار ساڵ بەر لە ئێستا،
ئاوا چیرۆكێك ڕووی داوە.
لە سەر یەك ماڵ و مزگەوتێك،
چەند ملیۆن بەشەر كوژراوە.

بڵێی گاڵتەی ئەم داستانە،
دیسان بە من بكرێتەوە؟
بۆ دەربازبوون لە شۆڕشێك،
دژە شۆڕش ڕێخرێتەوە؟

تەڕ و ئیشك دەسووتێنن.
خوێن دێ سەران بەرێ.
بەرهەڵستی كام مەبەستە،
ڕۆژهەڵات دەبێ تەخت كرێ؟

چۆنە كڵاو سووری توركان،
پەرچەمداری ئازادینە؟
دەرسیان لە مێژوو وەرگرتووە؟
یا مەرگی خەڵك بۆ وان ژینە؟

ئەمە جەنگی جیهانییە؟
یان دساینی مێدیایە ؟
ئەمە شەڕی سایبەرییە؟
یان جیهادی خاچ و خوایە؟

هەرچی دەکەم حاڵی نابم،
بە هیچ بارێ بۆم دانایە.
ڕۆژهەڵاتی "بوش"ە ئەوە،یان
بەرنامەی "ئۆباما"یە؟

چەندە دەگرێ ئەم پیلانە؟
تا کوێ دەچێ و ئەسەر دەکا؟
چی بە سەر دێ خەڵکی بێسەر؟
بە کام ئاواتی خۆی دەگا؟

کوان کتێب خۆران لە کوێن؟
شرۆڤەی ئەم گێژاوە چییە؟
ژەقنەموتی ئیدەکانیان،
ناوێکی تازەی پێ نییە؟!

**2011/2/23**

# سووتماك

لە گەڵ من ژیـــــا و مـــــاوە دڵێکی پــــڕ ژان و ئاوارە
دڵێکی وێڵ و تەنیـــــا کە هـــــەر ئاهێکی پێ ماوە.

گەلێك سووتا، گەلێك خۆیدا بە دەست دیدەی نیگاران
گەلێك پێکرا، بە سیحـــــری تیری غەمزەی چاوخوماران

گەلێك وەفـــاداری چـــوون، لەوی ون بـــوون، لە ناو ڕێدا
جەفـــــا و جەوریان بێهـــــەدا، لە هـــــەر لاوە تلیان پێ دا

چ پـــاکبـــاز و چ دڵبـاز و چ ســـادە و بـێ ڕیـــا بــــــوو
هەموو جارێ، وەك منالێ، لە دوای یاری گـــریا بــــــوو

هەنووکەش هەم غەریبی داری بە ڕۆحـــی داداوە
هەم بێوەفـــایی لە هەر لاوە چـــــڕنووکی لێ داوە

لەو دڵە ئێستا شێت و سووتاوێك بـــۆ خەمان مــــاوە
کەچی ئێستاش منالە و لـــە دوی یـــارە و نەگۆڕاوە.

2008
نەرویج

# هەر وەکوو من

هەتاو کزە لێرە کز هەر وەکوو من
سارد و بێ تین و وەڕەز هەر وەکوو من

دیار نییە هەیبێ، چ هیوایە لە دڵدا
دێ و دەچێ بێکەس و حەز هەر وەکوو من

لێرە پاشا و گەدا، شازی میر و وەزیر
دڵی کەوتووتە قەفەس، هەر وەکوو من

خۆشەویستان دەخیلە ڕوو لێرە مەکەن
خۆ مەدەن ئاسان بە دەس هەر وەکوو من

لێرە هەڵنایە چاوی ئەوین گەر بە تەمای
تەمەنت دەدەی بە با هەر وەکوو من

چاوەڕێی خۆر لێرە هەڵێ، گەرم و بە تین
نایبینی ئەتۆی نەبەز هەر وەکوو من.

**2019/4/9**
**نەرویج**

# ئەشقی خاک

کەژاوەی ژان، کۆ خەمی وەک من کەمن
خانەخوێی دڵ، مەحرەمی وەک من کەمن.

خەڵک زۆرن لێو بەبار و دڵشکاو
دڵ چزیلکی چزاوی وەک من کەمن.

هەن پیرانی دیدە تەر، ژین پڕ خەتەر
دیدە غەرقی خوێناوی وەک من کەمن.

چەندبەچەند هەن چیرۆکی زۆر دڵتەزێن
دڵبەزێن پڕ ئەشک و خوێن وەک من کەمن.

تاسەباری دیداری ئازیز هەزار
چاوەڕوانی تا ئەبەد وەک من کەمن.

ئاشقانی بێمراد یەک دەبینن
ڕوخساری یار نەدیوی وەک من کەمن.

هەزاران کەس دڵدارن بە ئازادی
بۆ ئازادی، نەماوی وەک من کەمن.

هاورێ و یاری سەردەمی خۆشی گەلێک
وەفاداری ڕازداری وەک من کەمن.

با هەزاران بن ئەوانەی وا لە ڕێن
بۆ ئەشقی خاک! پاکی خاکی ڕێگەمن.

**2013/4/17**

**نەرویج**

# سەر*

با لە کۆڕی گەنجی شاران بێتەدەر دەنگی گەلم
با لە تۆڵەی مەرگی شاخان بێتەبەر جەنگی گەلم

ڕۆژهەڵاتی کوردەواری کوانوی گەرمی پێگەکەم!
مەشغەڵانی ئاوەدانی بەرخۆدانی ڕێگەکەم!

ڕێی ئازادی کوردستانم، بێ تۆ، بێ سەر چۆن دەبێ؟
بێ ڕووناکی ڕێی خەباتم هێزی گەل بۆ کوێ دەچێ؟

کوانێ سەرداری سروودم بیری تیژی سەنگەرم؟
کوانێ ڕۆحی کۆڵنەدانم گیانی نوێ کاتە بەرم؟

گەل بە هێزی خۆی نەبێ چۆن، چۆن خەباتی پێ دەگا!
نۆکەری بێگانەکردن گەندەڵ و کۆڵت دەکا.

با لە کۆڕی گەنجی شاران بێتەدەر دەنگی گەلم
با لە تۆڵەی مەرگی شاخان بێتەبەر جەنگی گەلم

**2014/11/22**
**نەرویج**

* ئەم شیعرە لە لایەن هونەرمەند (خەبات قوڕەیشی) کراوە بە گۆرانی.

# ئەی مرۆڤی
# سەر ڕووی زەوی بزانن*

من ئاوارەم، هەر لە بوونم تا ئێستا
چارەنووسم نادیاروشێواوە
گیان بە ڕازی ئازادییەوە ئاوێتەم
ژیانم لە ناو ژان و ژارا کووژاوە.

کۆڵەباری خۆشەویستی لە سەر شان
ڕوو لە ئاشتی، بۆ هەر لایەك کشاوم
وێڵی شار و وڵاتانی دوور بوومە
بۆ پەنایەك، بۆ دڵسۆزیك گەڕاوم.

چی سنووری سەرزەوی بوو بڕیم پاك
بەڵکوو تووشی هاوڕێیەکی گیانی بم
دەرگای ماڵ و ڕێ و شەقامم لێ گیرا
تووش بە تووشی پیاوخراپ و جانی بووم.

من ئاشقی فراوانی و جوانیمە
تەنگەتاو و ڕەش و ناحەز کراوم
من سۆزداری سەودا سەری ئازادیم
لە ناو چاڵ و ژووری تاریك تەپاوم.

کوردستانیم. ناڕازی نیم بە بوونم
هەر ئینسانێك لە ڕەگەزێك خوڵقاوە
گشت گەلانی سەررووی زەوی ئازادن
بۆ کورد بوونم بە تاوانم دانراوە؟

ئـــــالآی وڵاتـــانی دنیـــام پـێ جـــوانه
وەك گـوڵسـتان دەشـەكێن لـە بەرچـاوم
بەڵام داخێك دێ بە دڵمـــا وەكـــوو ژان
بــۆ بێ ئـــــاڵا من بە تــەنیا جــێ مـاوم؟

ئەی مـــــرۆڤـی سـەر ڕووی زەوی بزانـن
تیشـكـی بـــــوونم ڕوونــــاكایی جیهانە
من شـەبەقی ڕۆژهـــــەڵاتی نـــــاوینـم
چاوپۆشـیتان لـە بــــوونی من تــــاوانــە.

**ئۆكتۆبری 2009**

**نەرویج**

* ئەم شیعرە لە لایەن هونەرمەند (ناسرِ ڕەزازی) كراوە بە گۆرانی.

# مناڵان! هاوڕێکانی من!

مناڵان من وەك ئێوە وام
بێ هەدام و بێ هەدام و بێ هەدام
هەزار پرسیار لە دڵم دایە
ڕووبارێکە و دوایی نایە.

جارجارە کە تەنیا دەبم
بیر لە زۆر شت دەکەمەوە
نهێنی ئەم جیهانە
زۆر حەز دەکەم لێك دەمەوە.

ئاسمان بۆ ئاوا دوور دوورە؟
زەوی لەبەر چی دەسووڕێ؟
ژیان بۆوەك ڕووبار،
توند و خێرا ڕادەبوورێ؟

گوڵ بەو هەموو ناسکی و جوانی
تەمەنی بۆ ئاوا کورتە؟
چۆن بە ڕەنگ وا دەنەخشێ؟
پەڕەکانی بۆ وا تورتە؟

دەریاکان بۆ وا قووڵن؟
شاخ بۆچی ئاوا بەرزە؟
کۆتایی ئاسمان لە کوێیە؟
چەند شوێنی تر وەکوو ئەرزە؟

زەوی چۆن بە بێ پشتیوان
لە ئاسمانا هەڵواسراوە؟
دەوری زەوی پڕی ئاوە،
ئەو ئاوە بۆچی نەڕژاوە؟

دەزانم گوڵی داران
هاوینان دەبنە میوە
بەڵام تام و ڕەنگ و بۆن
چۆن لە ناو گیانیان خزیوە؟

جوانی لە بەر دەستی زەمان
وەك پەڕی كا، لەبەر بایە
هێز نییە بیپارێزێ
زەمان بۆ لە وەستان نایە؟

ئەوانە و زۆر پرسیاری تر
دڵ و مێشكیان پڕپڕ كردووم
بە چیای سەد كتێب هەڵچووم
قەت لە خوێندن ماندوو نەبووم

منالان! هاوڕێكانی من!
گەر حەز دەكەن جێ نەمێنن
لە بیركردنەوە مەوەستن
لە پرسیاران دامەمێنن.

گەر حەز ئەكەن بە توانابن،
هەموو ڕۆژێك بخوێننەوە ،
گەر حەز دەكەن كە زانا بن.
كتێبی نوێ بهێننەوە

**2012/12/12**

**نەرویج**

# حەڵقەی «بازرگان»

لـــە ڕوخســـــاری ئینســانــەکــان کە دەڕوانــم
زۆریان شـۆخـوشـەنگ و جـوانن
بـــەڵام کـاتێك  سـەر بە دەروونـیـاندا دەکـەم
ژیـــلـــەمـــــــــۆی ئـازار و ژانـــــن.

ماوەیەکـە زۆر سـەیر، سـەیری سـروشـت دەکـەم
زەوی هـــــــــەر فــــراوانـــییـــە
کـە تــــــۆزقـاڵـێك لــە کــۆمــەڵـگا ورد دەبمــــــەوە
باس هـەر باسـی گــرانــییە.

هێندیك لـە کـۆتایـی جیهان دەدوێن ئەمرۆ
لـە چاڵـی ڕەش، نووری بـەرین
زۆربـەی خـەڵك بە دوای ژەمـێ نانـی شـەوێ
وەکـوو مـەڕ و مـانگـا دەژین.

هـەودای ژیان میلیۆن میلیۆن گـرێی تـێ کـەوت
تازە کـوا بـە تۆ چا دەبـێ
ئـەوەی بە دیلـی ڕاهات و پێـی ڕازییـە
هـەتا مـردن هـەر وا دەبـێ.
وەرە وەك مـن خـۆ بسـپێرە دەروونـی خـۆت
ئینسـان خـۆی، خـۆی بـێ باشـترە
کـە لە شـەڕی حیزبان کـەمێك دوور کـەوتێوە
تێگـەیشـتن ئاسـانترە.

زۆر جـــــار تـــەنیـــا بـــــە شـمـشـاڵـی قــالـە مـەرە
ئــارام دەگـــرن دەردی گـیــانـم

لای ئـێـــــــــواران کـــە **TV**کـەم  دەکـەمـــــەوە
خـــوێ دەکـرێـتـە زامــەکـانـم.

دیـمـوکـراسـی دوور لـە چـاوی خـەڵـك، خـوێنـە
بـە کـوشـتـن خـۆی دەپـاریـزێ
مـن هـەمـوو عـومـرم لـە ڕێـی ئـازادیـدا چـوو
هـەر ئـەویـش خـوێـنـم دەڕێـژێ.

جـاران لـە بیـرمـە بـە چـیای سـەخـت هـەڵـدەچـووم
لـە قـەدی شـاخـان ون دەبـــووم
ئێـسـتـەکـانـێ شـەو هـەتـا ڕۆژ لـە نـاو "سـایـت" ان
چـاو لـە وشـان هـــەڵـدەسـووم.

گــــــــۆرانـی عـــــەلـی مـەردان و شـیـــعـری هـێـمـن
چـــــەنـد هـــەویـنـی گـیـانـم بـــــوون
ئێـسـتـێ چـــــــەنـد کـتـێـبـی ڕەق و ئـێـسـکـگــران
کـاسـەی مـێـشـکـم دەجـوون.

زۆر جـــــــار ویـسـتـگـەی حـەسـانـەوەم لـە نـاو ڕازان
سـەر سـەکـۆکـانـی کـــــانـی بـوو
ئێـسـتـێ  بـەڵام کـە مـانـدوو بــــووم لـە دانـیـشـتـن
دەسـت و لاقـم دەگـرێ تـەزوو.

شـەوێـك چـــووم بـۆ سـەردانـی کـۆنـە هـاوڕێـیـە
خـەمـێـکـی دڵ بــــــرەهـێـنـم
ئـەویـش گـرفـتـاری حـەڵـقـەی "بـازرگـان" بـوە
قـسـان نـاکـا کـە دەیـدوێـنـــم.

**2010/11/8**

**نەرویج**

# غوربەت

بەربەیان کاتێ دەکێشێ تیشکی بۆشانی تەلان
خۆرئەدادڵ بەقەندیلی بەرزی شاکاری کەژان

دڵ هەتا عەرشی بان هەوران دەچێ و حەیرانی دەبێ
کوردستان خاکی سەد ڕەنگە، دڵ بە قوربانی دەبێ

کوردستان وا دڵ لە دووریت بووەتە خاك و خۆڵەمێش
ڕۆژ و شەو دایم دەسووتێ، بووەتە پاشای زام و ئێش

چەند دەبێ سەبرم لە سەر دڵ بێتە بار و خەم بخۆم
من کە شێتی شاخ و ناوباخ و هەوای دڵ پاراوی تۆم

دەردە کورد تیری داوە لێم، غوربەت گەردی وا لە ڕووم
گەر بزانی چەندە موحتاجی ئاوی سەرکانیاوی تووم

سەرچاوەی ژینی ئازاد و ئاسۆی ڕووناکی هەتاو
هەڵوەدا بوومە هەوێنی بوونم، لە دووتم بێ هەناو

دێمەوە تابێ ودەمەکەت، یان بە بەرماکاتەوە
باشنەی نەرمی داوێنی چیات، زیندووم کاتەوە

بۆنی خاك و بۆنی دار و بۆنی بەردی بەر هەتاو
بەسە بۆمن بێتە هێزو بێتە ژین و نان وئاو

خۆشەویستم، تۆی ئەوینم، کوردەواری خاکەکەم
قیبلەکەم، دین وئایین وشیخ وپیروچاکەکەم.

**2018/3/7**

**نەرویج**

# قەڵای پۆلایین*

عەفرین شارەکەم تیشکت گرتی جیهان
جیهانی کەڕی چاو کوێری نەزان

تەقا وەك ئەتۆم هەواڵی هیممەتت
سنووری شکاند ڕەوایی هەیبەتت

برام! هاوڕێکەم ! ئەی قەڵای پۆلایین!
شەڕڤانی عەفرین ئەی ئەویندارى ژین

وەك شێر وەستاوی ئەندەڕوون پڕ هەژان
دێن ئاگرت دەن لەشکری فاشییەکان

سەنگەرت قایم، قامەتت سەت چیان
سەد جار هاتوون و هەر سەد جار تێکشکان

مێژووی کۆن ڕۆیی، مێژووی نوێ وا ڕێ
بەرخۆدانەکەت جیهانێك دەگۆڕێ.

**2018/3/14**

**نەرویج**

* ئەم شیعرە لە لایەن هونەرمەند (سامان کورد) کراوە بە گۆرانی.

# شاری بێ دەنگ

وابەهارە خاکەلێوە گوڵ بەڕێوە با وەشە
کەش لەبارە، شیبایە لە شینگایان، دڵ گەشە

کوردەواری نیشتمانی ئاوەدانی شیرینم
شاخ و دەشتی ئاڵەڕەنگی بێسنووری لێ ونم

کوانووی گەرمی بەرخۆدانی بێوچانی چارەکەم
ماڵ و پێگە و ژیان و ڕێگە و دێ و گوند و شارەکەم،

کوان ئەوانەی چۆك بە مردن دادەدەن قەت نابەزن
بۆچی وا مات و بێدەنگ و ڕەنگ و داماو و کزن؟

هۆگرانی بیری نوێ کوان چین لە سەر چین بێنە دەر
کوان کرێکارانی یاخی تۆویی خەباتیان بێتە بەر؟

کوان کچانی ڕوو بە خەندە ڕوو بە مردن پێکەنن
ڕەگ و ریشەی ستەمکاری هەر لە بنڕا هەڵکەنن؟

ڕۆژهەڵاتی چاوەڕوانی شان و با هۆ پڕ لە هێز
شور و شعوری شۆڕشی سوور و دوورەپەرێز؟

من خەریکە شێتم دەکا شاری بێ دەنگی حەزین
نایەتە ئەقڵم کورد و سەر لە ئەژنۆنان و بەزین.

**2020**
**نەرویج**

# هەواڵی ڕۆژانی سەختم تۆ کوای؟

نە دنیا دنیای جارانە و
نە ئێمەش مرۆڤەکەی جاران.
نە هەوا هەوای یارانە و
نە ئێمەش یارەکەی جاران.

جاران لەگەڵ یاران ڕۆیی و
ئێمەش بۆ خەم ماینەوە،
هەوای یادی یاران ڕۆیی و
هێدی هێدی تواینەوە.

جارانی ئێمە تۆ لە کوێی؟
برووسکەی هیواکانمان تۆ کوای؟
کوا مارشی سروودی سەرکەوتن؟
هەواڵی ڕۆژانی سەختم تۆ کوای؟

**2020/4/26**

**نەرویج**

# تەرمی خاکم بۆ کوێ بەرم؟

دڵ سووتاوی هەر چاو لەڕێ
ڕێگە چۆڵ کەن هەستنە سەر پێ

تەرمی خاکم لە سەر شانە
بۆ بارەگای یوئن دەچێ

ڕێز ببەستن درشت و ورد
باوك و برام، دایکانی کورد

تەرمی خاکی خۆم دەگێڕم
بەس نازانم بۆکوێ بەرم؟

هەرچی کردم یوئن نەیویست
بێ ناسنامە دەنگی نەبیست

تەرمی خاکم لە سەر شانە
تەرمی خاکی خۆخۆرانە

گەندەڵکاری وای لێ کردوە
لای میللەتان بێ بایەخ بوە

شانم کز و نەوییە سەرم
تەرمی خاکم بۆ کوێ بەرم؟

**2015/7/8**

**نەرویج**

# لە وڵاتی من

لە وڵاتی من ئەمرۆ
هەموو شتێك دژ بە خۆیەتی.

لێرە
بەرپرس گەندەڵ
ڕابەر گوێلەمست
مامۆستا گەوج و
دوكتۆریش بازرگانە.

لێرە
مەلا سەرچاوەی شەرارەت
سەرباز دژ بە دوژمن خوێڕی
كەر بیرمەند و
مەڕیش پاڵەوانە.

لێرە
سیاسەتمەدار دوژمنی خاك و نەتەوە
خەڵك سەرچاوەی فەساد
ژن مایەی شەرم و
پیاویش حیزی دەورانە.

لێرە
چاپلوس خۆشبەخت
ڕاستگۆ بەدبەخت
سەگ گورگە مێش و
پڵنگیش چاولەدەستانە.

لێرە
هونەرمەند شێت
بێ هونەر مۆزەوان
دانا سوڵکەر و
ئەقڵ سووکیش پرۆژەوانە.

نازانم، من نازانم.
ئاخ، کە نازانم ئارەزووی چ بکەم بۆ میللەتێك
کە بەم حاڵە
وەك تۆپی پێ
شەپ شەپێنی داگیرکەرانە.

**2013/12/27**

**نەرویج**

# سکوت ئێستا کاری مەڕە

لەم سەر، تا ئەم سەری دنیا
لە چینەوە هەتا کووبا
لە دانوبەوە هەتاکوو دۆن
هەموو ڕووسیەی تازە و کۆن
لە ئورشەلیم تا پاکستان
هەموو ڕۆژهەڵاتی جیهان
لە ئەفریقای رەش و لا ون
لە ئەسکەندروون تا کتیپ تاون
هاوار و ناڵە و سۆیە
مەرگ و سووتان و ڕۆڕۆیە
سۆنامی شەڕ مەوجی داوە
بە سەر خەڵکادا بشراوە
لە باکووری سەهۆڵبەندان
هەتا رڵمی عەرەبستان
خۆف و خورافە ڕێك خرا
ئاڵای نەزانی هەڵدرا
مناڵ گەوزا لە خوێن و خۆڵ
شینی گێڕا دایکی ڕەندوڵ
جیهان لیپاولیپی شەڕە
سکوت ئێستا کاری مەڕە
خوشکم، برام، خزمم، کاکە
بۆ وشیاریی ئێستا کاتە
هەستن لەخەو خەوی مێژوو
کاتی بێدەنگی بەسەرچوو
ئەی گەنجانی دڵ کەیلی ژان

تاکەی سووتان؟ تاکەی سازان؟
لە مرۆڤبوون کەوتوە مرۆڤ
ژیانی لێ بوە بە ئێش و ئۆڤ
ئازادی هەر خەمە و دڵخواز
خۆشی بوەتە هەوێنی ڕاز
سەریان لێتان شێوان، شێوان
سەد کەلێنتان کەوتە نێوان
لە هەر جێیە هەر فەوزایە
کەی دەزانن بۆ ئاوایە؟
لە خوێنتان گورگ بوونە شەریك
تاکەی دەبن تاك و تەریك؟
تاکەی مەرگ و چەوسانەوە؟
چرای هومێد کووژانەوە
تاکەی سڕ و لێك سڵکردن؟
هەر جودایی و خۆ لە تکردن؟
مرۆڤ! تاکەی تۆ ڕانابی؟
تاکەی بێ دەنگ و توانا بی؟
سوودپەرەستانی سەردەم
ئێسك و پێستیان کردیە بەرهەم
نە خوێن ماوە و نە ڕچە و زێد
چی ماوە تا بە سەرتا بێت؟
دنیای شیاوی ئینسانی نوێ
تاکەی لە ناو دڵتا بنوێ؟
ئەو خەوەی تۆ بۆ وا قووڵە؟
کەی ڕابوونت دێتە جووڵە؟

2008
نەرویج

# مرۆڤبوونت مەدە بەدەستەوە!

بۆ ئازادی تا دەتوانی بژی باشە،
ئەگەر دیلی هاتە ڕێگات،
ئەگەر مەڕێك،
لە جیاتی خۆت گرتی جێگات،
گەر وای لێ هات
کە تاڵاوی پووچیت بە گەروو داکەن،
ئەگەر هاتن،
تابووتی مەرگ بۆ هیواکانت چاکەن،
ئەوسا،
شێری یاخی بوونت خەبەر کەوە،
لە جەنگەڵی ئەم وەحشیانە یاخی بە،
مەمرە وەك مەڕ،
تابووت بشکێنە هەستەوە!

هەرگیز مەبە بە مەڕ
مرۆڤ بوونت مەدە بەدەستەوە!

**2020/4/16**

**نەرویج**

# قوربان

لەمە زیاتر دەبێ چی بکەم
ئەی بێ وڵات،
بێ کیان، بێ چاوی سەر
بێ ناسنامە،
تۆ ئاخر کەی تێ دەگەی
ئەم جێژنە سەڵای مەرگی تۆیە
تۆ ئاخر کەی تێ دەگەی ئەمە
ئەنفالی شانە شانەی مێشك و
نوگرەسەلمانی هەموو ساڵەی تۆیە.

ئەم جێژنە،
بۆ سڕینەوەی خۆت و خەونەکانت
قەنناسێکی مەخزەن پڕی لە سەر پێیە.
لە مەککەوە هەتا بەغدا،
لە تاران تا ئانکارا
دووربینەکەی لە دووی تۆیە، لە سەر ڕێیە.

من نازانم چەند ساڵ و چەند سەدەیە
لەخەودا تۆ دەویرێنی و دەڕۆی بێ سەر
داخەکەم نە خۆت خۆتی و نە ڕێت ڕێیە.

خۆزگە لەم خەوە ڕادەبووی
خۆزگە دەتزانی ئەمە
سووری سفرەی بەزمی داگیرکەر و
ساتی تەرمی ڕاکشاوی کورد و
جێژنی مەرگی مێشکی تـــــۆیە.

# له پای چی وەستاوی؟

ئەگەر ژیانیان
کردوویە خەونێکی ئاڵۆز و
وەکوو پەتێك
لە گەردنی هیواکانیان کردووی،

دوو دڵ مەبە،
ڕایەڵی ئەم خەونە بپسێنە!

ئەگەر ئاوێنەی ئارەزوویان
لێ ورد کردووی،
ئەگەر دەوڵەتدار و ستەمکاران،
بەهەزاران دەردی بێ وادە
جەرگیان بە سیخەوە کردووی،

لە پای چی وەستاوی؟
بۆ واقت وڕماوە؟
هەتا زوە،
لە بکوژی هیواکانت یاخی ببە،
خۆ ڕاپسکێنە
ببزوو هەوڵێك بدە تا،
برستێکت تێدا ماوە!

**2020/4/27**

**نەرویج**

# کاتی هاتوە!

بەسیە سێدارە و ئەشکەنجە و زیندان
بەسیە بێبەشی و کزی و دانوان
بەسیە کەساسی، گەنج و لاوەکان
کاتی خۆیەتی لە دوژمن راسان،

کاتی هاتوە بەرز کەی دەنگت
دەرخەی ئازاری ئەو دڵەی تەنگت
لادەی لە ڕووتا غوباری داماں
سارێژ بێتەوە سینەت لە زامان،

هاتوە سەردەمی گرد و کۆوەبوون
پشت بە پشتی یەك ببینە ستوون
هاتوە ئەو دەمەی بە خرۆشی لاوان
فرمێسکی خۆشی بڕژێتە چاوان

ببە یەك پەیکەر بگرە ملی ڕێت
زەوی بلەرزێ پشتی لە ژێر پێت
جەنگەی یەکگری و سنوورشکانە
ڕۆژی تۆڵەیە و دوژمن قرانە.

نەما ئەو ڕۆژەی دوژمن خۆرانێ
بۆ ڕاوی گەنجان بێتە مەیدانێ
نەما ئەو ڕۆژەی ئەو گورگە هارە
لە شار خۆ بادا وەك داشە هارە

لاوی شۆڕشگێڕ کوەوە بن لە شار
یەکدڵ و یەکدەنگ، یەك ڕیز و هاوکار
کۆڵبەران با بێن ببنە پێشمەرگە
بست بە بستی شاخ بکەن بە شەڕگە

بە هێز بشکێنن دەرگای زیندانان
با ئازاد کەن لە بەندیخانان
با شۆڕش خوێنی بۆ گیان بێتەوە
ئاڵای ئازادی بشەکێتەوە

ڕۆژهەڵاتی کورد بەسیەتی بریا
چاوەڕوانی کورد قەت دادی نادا،
هاتوە ئەو ڕۆژەی قۆڵی لێ هەڵکەی
ڕابی شێرانە، داگیرکەر دەرکەی.

**2019/5/21**

**نەرویج**

# حیزبایەتی لە وڵاتی ئێمە

لە وڵاتی ئێمە
حیزبەکان وەك زەوی جووتیاری فەقیرن
پەڵەپەڵە، کەرتکەرت
بەردەڵانی پڕ زەحمەتی بۆ ئاو، بۆ قوت
کاتی سەرخەرمان
پێی دەپشکوێ چاوی دوژمن، چاوی حەسوود.

لە وڵاتی ئێمە
جەغز و سنووری حیزبەکان
وەك پەرژینی جووتیاری کوردن
دیواری ئەستووری تیژە بەرد
قاشە شووشە و تووترك و گەسگەسك
تێل درِوو و کوڕانی چاو زیت و کەللە ڕەق
دەرس دادراوی دەسوەشێنی ڕۆژی شەڕ.

لە وڵاتی ئێمە
ژینی ئەندامانی حیزب
وەك ژینی خانەدانی مڵکداری داڕێژراوە،
ڕابەر بابە
خاوەن زەوی و ماڵ و سەروەت بابە
خاوەن ماف و قسە و هەڵوێست بابە
بابە خاوەن فکر و خاوەن ناوە

ئەوەی تر هەر چی هەیە
هیچە، بەردەستە، بێدەستە، جووتیارە، بێگارە، ناسۆرە، پێڵاوە.

ئای چ تلسمێکە ئەم ڕووداوە
بێ جەمسەر و بێ سەرداوە
نە ڕێ دەکا بۆ پێشەوە
نە وا هەیە بکشێتەوە.
وەك کەری جووتیاری کورد
بە چوارپەلی چەقاوە قوور
چاوی لە ڕێ ئەوق ماوە
وا دەنوێنێ ناگاتە جێ
مەنزڵێکی مالوومی نێ
بێ جەمسەر و بێ سەرداوە
تەلسمێکە هەموو کوردی تێدا وڕ کراوە.

**2002**
**نەرویج**

# بۆ ماچێکی لێوی ئاڵ

« ئەمرۆ جێژنی دڵدارە
لە باخی خۆشەویستان
هەر تاوێکم لێ گەڕێن
لیمۆی بگرم بە دەستان».
فۆلکلۆر

فەرمووت دەچمە هەواری
جەنگەی مانگی گوڵانە
خاکی ڕێگای کوێستانێ
دەماڵم بەو چاوانە.

ئەمڕۆ دوو ڕۆژە دووری
ئارامم لێ بڕاوە
نازانم ڕوو لە کوێ کەم
قیبلە و کەعبەم گۆڕاوە.

تاڵی هەور با بردی
ڕووناك بۆوە بەرچاوم
خەریك بوو گیانم دەرچێ
چاوی کەوت بە چاوم.

دەنگی خرخاڵ و بازن
بەهەشتی موسیقایە
کاتێ کە تێکەڵ دەبێ
بەو لەنجە و سەمایە.

لە باخی هەوای تۆ دا
وەك بولبولی دەخوێنم
بۆ ماچێکی لێوی ئاڵ
شەربێ حەڵالە خوێنم.

**2005**

**نەرویج**

# هەستێك

لـــــه دەروونی تـــــۆدا هەیە هەستێك
دەكێشێ دڵی من بێ پـــرس و پەسا

هـــەردەســـــووتێم و مـــۆمی تـەمـــەنم
وەكوو سەبرم هەر تواوە و لە كەمیدا.

# بۆ کازیوە مهابادی

کچێ جوانی کچێ جوانی
شازی هەموو سلفییەکانی
پێکەنینت لە دڵڕایە
زۆر بێگەرد و بێ ڕیایە.

کە تۆ خۆتی و خۆت ئەنوێنی
ڕچە و سنووران دەشکێنی
ورە بەرز و لەخۆڕادیو
تۆ جیاوازی، تۆ ڕاپەڕیو.

بێ مننەت بە لەو پیاوانە
کە خۆ بوونیان پێ تاوانە
کچێ شازی، کچێ شازی
مایەی هومێد و شانازی.

کازیوە بە، هەر کازێوە
پڕبە دڵت بگەشێوە
پیاوسالاری هەڵتەکێنە
ڕازی ژن بوون بدرکێنە.

ماکی ئازادی هەر ئەتۆی
سەرچاوەی شادی هەر ئەتۆی
پەیامی تۆ هەر جوانییە
پەیامی تۆ کۆبانییە.

# مەحاڵ

لە خەونمدا
ماوەیەکە هەموو ڕۆژێ تووشت دەبم
گوڵی لێوانت بە ڕوومدا دەکرێنەوە،
کوڵمە ناسکەکانت سوور و سوورتر دەبن،
بە پێکەنین دادەگیرسێن، دەژێنەوە.

لە خەونمدا،
تا بۆم بکرێ لە گەڵ تەنیایی دادەنیشم،
تۆ دێیە لام و شان لە شانم دەخشێنی،
کە تاریکی لە دڵی مندا شەپۆڵ دەدا،
بە ئەستێرەت دڵی سەرکەش دادەهێنی.

لە خەونمدا،
من خمی خەم لەبەر وشەکانم دەکەم،
تۆ دێی و لە بزەی شیرینیان هەڵدەکێشی،
من هەر مت و مات و کپ و خامۆش دەبم،
تۆ گڕی جوانی پەرستیم هەڵدەکێشی.

لە خەونمدا
مەوجی گەرمی، دەنگی نەرمی ئاسمانی تۆ
تۆز و گەردی پیریم لە ڕوو دەشواتەوە،
ئەوق دەبم لە قوولایی لەرانەوەی،
مێهرەبانیت گەنج و جوانم دەکاتەوە.

لە خەونمدا،
کاتێك لە ناو بیرەکانمدا بێ دەنگ دەڕۆم،
گەنجانە دێیە لام و ئارام دەستم دەگری،
ڕێ دەگۆرم لە دەست ئەشقت ڕزگارم بێ،
بە ڕێیی تردا دێیە سەر ڕێم، ڕێم لێ دەگری.

لەخەونمدا،
لە من ون و لە دڵ دوور و ناتەبا نی،
بە یەك یەکی نهێنیەکانم دەزانی،
ئازای گیان و دڵ و ڕۆحم تۆ دات گرتوە،
تەنیا یەك پێچ، یەك کۆد ماوە کە بیزانی.

چەن خۆشە
لە خەونمدا شاد و بەخشەندەی،
لە تاوت شیعرم ڕێی چیای بەرز دەگرێ،
خۆت دەزانی پەری ئەرخەوانی پۆش،
دوور لە جوانی تۆ، شەبەق نامێنێ، دەمرێ.

# تـــوانەوە

تاڵـی قـــــژی ئاڵ، پێـــچ پێــــــچ بە لادا
بە ســـەر بـــزەی چاو، کـــوڵم و گـــونادا
دەڵـــــەرێتـــــەوە بـــە لــــەنجـــــــە و بـایە
جـــوانـی ئەو لەنجەت لە وەسف نـایە.

دەورتـــــدا بە کل ئـــــــــەستێرەت چاوت
بە بــــــزان ئـــــارات نیـــــگای پـــاراوت
گـــــــرتە دڵـی من ئەو تیشکە گـــەرمە
هـەلا هـەلا بووم بـــــــەم نیگـا نەرمە.

توێ توێ دڵ تواوە و ڕەنگ لە ڕووم ون بوو
هەست و بـــــرستم هەنجن هەنجن بوو
کە غـــــــونچەی دەمت بـــە دەم نیگـــاوە
بـــە زەڕە بە زەڕە ی نــــازت دەکـــــراوە.

باسکـی بلوورت تورت و سپـی و ســــــۆڵ
ئەنگوستـی شـووشـت ناسك و نەرمونۆڵ
شـەنگـی بــــالاکـەت ئــــــالان بـە ڕەنگـــــان
ئەی هاوار شێت بـــووم کەوتمە شاخان.

نــــەرم دەڕۆیــــی و نــــەرم نــــەرم دێی
شــــەرم نـاکـــەی و هــــەتا ســــەرم دێی
گـــەرمــی ڕوخـــســـارت دەدەی بــە چـاوم
ناپرسـی بــەلام لــە دڵـــی ســــووتاوم.

سەمفۆنیای وشەت باڵی کێشاوە
لە ناو ڕۆحی من لانەی داناوە
وشەی شیعری من بێچووی ئەو لانەن
چپە و جریوەی ئەو مەلە جوانەن.

دڵی ڕوونی من، ڕوون وەکوو کانی
پێی حەشار نادرێ نەهێنییەکانی
سیحری دەنگەکەت ڕۆحی کێشاوم
داویە لە ڕیشەی جەرگ و هەناوم.

وەك ئەو مناڵەی وەرناگری دیاری
گەستوویە ئازار لێوی بەباری،
ئاوا بۆ تۆیی بە منەوە دیارە
نە یاریم هەیە و نە دیاریم دیارە.

خەڵکان با حەز کەن بە بوژانەوە
بە ماڵ و مڵکان، دڵ گەشانەوە
من حەزم لەو دەردە، دڵم بەو شایە
هەموو خۆشی ژیان لەم دەردە دایە.

نازانم من چیم، تۆ دەبێە چی من
نازانم چی بکەم، تۆش ببی وەك من
هەناسەت سوار بێ، گەرم بێ سینەت
شیرین شیرین بێ، تاڵی ئەم ژینەت.

# بۆچی نایەی

بۆچی نایەی بێ تۆ دڵ وێرانەیە
دیدە لێڵ و وێڵ و بێ هێلانەیە،

بۆچی نایەی تا ماوە ئاهێ لە دڵ
بۆ بەرم من مەیلەکەت بۆ خاک و گڵ

بۆچی نایەی لا لە من ناکەیتەوە
بیماری دەستی خۆت چا ناکەیتەوە؟

دیدەکەت خۆ دای بە من هەرچی هەبوو
مێهرەبانی، خۆشەویستی، ئارەزوو

مەیلەکەت وەک مەی بە خوێنا چووەتە دڵ
یەک بە یەک خەونەکانی کردوومە گوڵ

لە خەوما شەو ئەبیە خۆر و هەڵئەبی
ون ئەبی ئەمما بە ڕۆژ، ئاوا دەبی

ئەستێرەکەم تۆ بۆ بە ڕۆژ ئاوا دەبی
من دەبێ چ بکەم کە تۆ ئاوا نەبی

چی بکەم من تا تیشکەکەت لێم داتەوە
ڕۆژیشم وەک شەو خۆش و ڕووناک کاتەوە.

# مهاباد

وەك باڵدارێ دەفرێ ماندوو دەبرێ ڕێگای دوور
وەك شاخەوان تەك و تەنیا بچێ بەرەو ژوور

وەك پاپۆڕێ لە دەریادا سەرگەردان مابێ
وەك كاروانێ لە بیابان شەوی لێ دابێ

وەك شەرڤانێ ئاخر هیوای بە هەڵدێرێ بێ
مەودای ژیانی یەكلەسەدی كاتژمێرێ بێ

وەك پەپوولە كە بەهارێ، كۆی تەمەنی بێ
وەك گوڵبەردێ تەنیا بەردێ جێو وەتەنی بێ

مهابادم من باڵداری ماندووی ڕێگەی تۆم
شاخەوانی تەم توومانی دووند و پێگەی تۆم

بایەوانێك لە دەریای خەم سەوڵم هەڵداوە
بۆ كەنارت خۆم لە كێوی سەت شەپۆل داوە

لە خەمت دا شەڕڤانێكی دەورە گیراوم
گڕی گرتووە گەرووی بەند و دەنگی خراوم

پەپوولێكی، بێ بەهار و، بێ گوڵ و دەشتم
گوڵبەردێكی، ریشە تینووی بارانی وەشتم

بێ تۆ دنیام تاریك تاریك، ون بووە لێم هەتاو
سووتماكی هەزار جەنگم، بوومە كۆی زووخاو

ئەوینەكەم، شاری خوێنم، شاری شارانم
مهابادم، كانی عەزمم، هیوای یارانم

كاتە بۆ جەنگ بۆ سەركەوتن كاتی راسانە
با وڵاتێك لە دایك بێ لەم شارە جوانە

**2020/7/17**

# ئێستا و جاران

جاران ژیان بوو کۆی دەکردینـــــەوە
ئێستاکە مردن.

جاران  بە مەرگ بوو، پێ دەکەنین
ئێستاکە دەگرین.

جاران لە ئاسۆ هاوسەری خۆر بووین
ئێستاکە نەوین.

جاران سەر لە سەربانی ئازادی
ئێستا لە زەوین.

جاران بوومان ئەوینێك و چەكێك
ئێستا بێ ئەوین.

جاران!
ئای جاران تۆ ئێستا لە کوێی؟
چۆن بێ تۆ دەبین؟

لە تۆ ڕایە هێـــــــز و وزە و ڕێـــــــزم
چۆن بێ تۆ بـــژین؟

جاران وەرەوە، بێنەوە جاران
ڕوونی کەوە ژین.

لە تاریکی دەترسێ چاوی مرۆڤ
کوا ڕۆژی ئەوین؟

بۆچی هەموو بێدەنگ و کپ و کڕ
بێ پرس و حەزین؟

بێکەس و هەست و تاق و بەتەنیا
تاکەی بکەوین.

لانی کەم  بێن بەر لە مەرگ
بە دڵێکی ئازاد بژین.

**2018**
**نەرویج**

# جیاوازی

ئەم شیعرە ورەی لەوانەیە کە لە ژێرناوی کوردایەتی و چەپایەتی‌دا، ئێرانچییەتی دەکەن.

ئایا خەڵکینە جیاوازی نییە،
لە نێوانی ڕازی ئەشق و دڵی سەردا
لە نێوانی گوڵە باخ و دڕك و دڕدا
لە نێوانی زێڕی سوور و زەردی زرڕدا
لە نێوانی خۆری گەش و تۆپی قوڕدا
لە نێوانی ئەستێرە و کوێرەکانیدا
لە نێوانی هەڵگورد و گۆڕەپانیدا؟!

ئایا خەڵکینە جیاوازیی نییە،
لە نێوان بەرخۆدان و بەر بە دوژمندا
لە نێوان سەربەرزی و دیلی خوازیدا
لە نێوان پێشمەرگایەتی و سەربازیدا
لە نێوان خۆ نەویستی و خۆ خوازیدا
لە نێوان خەمی خاك و هەڵپەرەستیدا
لە نێوان سەربەخۆیی و ئێرانچیەتیدا؟!
من هیچ ناڵێم، بەس ئێوە بڵێن.

**2020/10/5**

**نەرویج**

# ئەڵماسی دۆڕان

ئێوارەی من وەکوو ئێوە پڕە ناخی لە ئازاری
کە ئاسان نییە قەت بتوانم بەیانی کەم بە گوفتاری
لە غەریبی تۆ پەریوە دەردەکانم بە ئاسپایی
لە سەر لوتکەی بیر و هەستم بەفری پیری دای سپیایی
چیی دابنێم بۆ سەربەرگی ئەو ڕۆمانەی بوو بە ژینم
وشەی شکان، یان نا مردن یا وەکوو مۆم تەواو بوونم؟
چی بڵێم من، چۆن دەریخەم هەستی تاڵی نەمانی ڕێم
کام وشەیە یارمەتیم دا بۆ لاوانی سەر ڕێم بدوێم؟
مناڵیی من، دڵ، پشکۆ بوو وەکوو ئاگر پاك و ڕووناك
هەستم دەکرد، کە ئازادم بەرز و شادم دوورم لە خاك
لە چاومدا چەپکێ گوڵی کەسك و سوور بوون خەونەکانم
بۆ سەرکەوتن من خوڵقابووم. باوەڕم بوو بە ئەنجامم
هەموو شت گوڵ، کانی و تاڤگە و کەژ و چیا و چەمی ژینم
پوورەی دابوو وەك شانەی هەنگ، گەشاوە بوو ڕێی ئەوینم
لاوێتی من سەراسەر سوور چەشنی ئەستێرەی ئازادی
پێنج پەڕی بوو، سەربەخۆیی، کار و یار و بەخت و شادی
ئارەزووم بوو ڕۆژێ دابێ، بە دەستی خۆم ئەم ئەستێرە
دەم لە یەخەی هەر مرۆڤێك ژێردەستەیە یا وەرزێرە

ڕێی ئازادی هێنده ئەمما تووش و ئەستەم هاتە ئارا
ئەستێرەکەی ئاوا کردم هیوا و هێزم هەمووی تارا.
ئێوارەیە و ئێستا تەنیا لە ژوورێکدا قەتیس ماوم
پیاوانی پووت ڕەشیان کردوە هەموو دنیا لە بەر چاوم
ئارەزووم بوو چەشنی ئەڵماس سەخت و لەشکان نەهاتووبن
نەك وەك ئێستا پەست و دۆڕاو شەرمەزاری داهاتوو بن
ئێوارەیە و وەکوو ئێوە پڕە ناخم لە ئازارێ
کە ئاسان نییە قەت بتوانم بەیانی کەم بە گۆفتارێ.

**2011/6/25 ـ ( پوشپەری 1390 )**

**نەرویج**

# قــــەڵــەم

شاعیران کاتێک لە ئاست حەقیقەت و راستەقینە تاڵەکان، لە ئاست کارەساتی سامناکی دەسەڵاتداران، دەتاسێن و تەنانەت بواری ئەوەیشیان نابێ تا هاورا و دادی مافخوازییان بە گوێی ئینسانەکان رابگا، لە حەسرەتا قین و هەست و سۆزی دڵ و کوڵ و ئەسرینی خوێنینیان بە ئاوی شیعرەکانیان دەشۆنەوە.

لەو کاتانەدا قەڵەمی شاعیر دەبێ بە زەلزەلە سەنجێک و رادەی بەرینی و قووڵایی کارەساتەکان نیشان دەدا. رەنگە من ئەو شاعیرە هەر نەبم، بەڵام ئەم شیعرم رووی لە قەڵەمێکی وەهایە. قەڵەمێکی نووک تیژ و کوڵ و کۆ دارێژ، قەڵەمێکی رەوان و بێ گرێ لە دەستی شاعیردا کە بێت و بچێ و دەردەکان و ئاسەواری سامناکی رووداوەکان و هەست و بیر و یادەکانیش بێنێ و بەرێ و وەکوو وەستایەکی زاناش راستیەکان توێ توێ لە سەر یەک هەڵچنێ. ئەم شیعرە روو لە شاعیرێک دەنێ کە هەستی، دڵی، وتەکانی و وشە و پیتەکانی و جەوهەری خامەکەشی بۆ ئاگردانی خەباتی خەڵکێک پشکۆ بێ کە لە مێژووی ئینسانی دا رەنگە هیچ نەتەوەیەک بە گشتی وەک ئەو لە مەرارەتی دیلی و رەنجی قووڵ و نەکبەتی بێ رادەی ئەم نیزامە هارەدا تا ئێستا وەها بە ساڵا نەچووبێ و هێشتاش هەرچی لە مێشک و خەیاڵی کەس دا ناگونجێ بە سەری دێ.

قەڵەم ئەمشەو دڵەکەم کەیلی خەمانە
خۆ ناگرێ لەبەر چزی ئەم دەردە گرانە

سەراپا کپ و مت بووە گیانی بە وزە
کاس و سڕ و سست کەوتووە لێی نایە وزە

قەڵەم شاهیدی ئەم سەر و ئەحواڵەمی تۆ
لە جیای جەرگی بە برینم تۆ وەرە گۆ

ئەوەی ناگوترێ بە من دایرێژە وشەت
با وەکوو ئاگر بگرێ پیت و وشەت

من هەمانم کوری گۆڤەندی کێو و تەلان
دیلی چییە دڵی داخداری سووتاوی بە ژان

قەڵەم وەر ئەمشەو تۆ بە توێی جەرگم بنووسە
وشەی من هەر گوللەن و بۆ جەنگم بنووسە

کۆترەکەی سوڵح و ئاشتی وا باڵی شکاوە
بە تیری خەمی بێ جێی جەرگی براوە

قەڵەم پەنجە و پەڕ و باڵی هەڵۆت یتژ کەرەوە
باوەش بۆ دڵی پێکراوی ئاسۆی سوور بکەوە

وشەکانم با لە توێی ئاسمانی دڵی سوور
شاهەڵۆ بن، بەرز بفڕێنەوە ژوور

قەڵەم دڵ پڕ کوڵ و کۆ و بینایت و دەزانی
چۆنە وا لەو دەردە گرانەم دووریت و نەبانی؟

داخی گرانم قەڵەمی دڵ پڕ لە دڵۆ
چەن تاڵە کە دەڵێن نیە باو باوی هەڵۆ

هیچ نەڵێم، هیچ؟ هیچ نەکەم باسی خەمانم؟
هەر کاس و سڕ و سست بن خەت و وشەکانم؟

وەك دار و دەوەن لەت و کوت کوت دەکرێ لەشم
لە کوێ نەپژا، نەرژا، سەر و خوێناوی لەشم؟

بەسەرهاتی خەمینم دڵی زۆرداری تەزان
هەموو دژ و دژومن و نامۆم هاتوونە زمان

قەڵەم هەڵناگرێ دڵی من باری خەمانم
بێزارە لە کزی و سڕ و سستی وشەکانم

بانگی هاوار وشەی پڕگڕ و قینداری دەوێ
ڕەنگی سووری شیعری «پشکۆ» ی گیانداری دەوێ

لە تۆڵەی هیرۆشیمای[1] منی کوردی بە قین
گشت نەزمی ستەمکاری دەبێ بێتە تەقین.

(1) هیرۆشیما کورد مەبەست «هەڵەبجە»یە.

**بۆتێ 1367/1/1**
**1988/3/21**

# هـــــاوار*

دەنگی هـات و تـۆزێ بـاری    چـاوی ئاسمان کەوتە تاری
بە داسی مەرگ درووییانم    بوو بە جەهەننەم ژیانم

من دەس خاڵی لە سەر زەوی    ئەو بە بۆمبا لە ئاسمان
هەرچی مەرگ و نەگبەتی بوو    بە سەر منی دا داباران

دڵی پڕ سۆ سووتێندرا    ئاگر لە جەرگم بەردرا
لەبەر چاوی ئەم دونیایە    شانۆی مەرگم هاتە کایە

سەرتاسەری دنیای زاڵم    بێ دەنگ و کپ لەم رامان
کۆا کێ پرسی، کێ بۆی گرتم    دەستی تاوان، دەستی تاوان

* * *

ئەزیزانم، ئەزیزانم    تەشەنانە برینانم
باڵی ئازادیم شکاوە    کۆشکی خەیاڵم رووخاوە

ئەوانەی وا نەنگی دنیان    کەسەری شانی گورگی شاخان
چنگیان دایم بە خوێنەوە    لە سەر سەرم دەخولێنەوە

لەبەر چاوم سەرم دەبڕن    لە هاواریش دەمم دەگرن
هاوار هاوار لە بێدادی    هاوار هاوار بۆ ئازادی

تاکەی بدروون، بدرن، بگرن    رێگای ئازادیم لێ بگرن
هاوار هاوار لە بێدادی    هاوار هاوار بۆ ئازادی

* بۆ شەهیدانی دۆڵی بالیسان و وەرتێ کە لە بۆمبارانە شیمیایەکاندا گیانیان بەخت کرد.

* ئەم شیعرە لە لایەن هونەرمەندان (بەکری لەگزی )

**گولان 1368ـ 1989**

# وەرن با پەرە بە هونەر بدەین!
# بەڵام هـونەر چیــە؟

ئەمەی لێرەدا دەیخوێننەوە کورتەیەک لە باسێکی ح. شەبەق ە کە لە پاشکۆی پێشەنگی (12) لە مانگی شەشی ساڵی (1991) و لە ژێر ناوی «ژیان و تابلۆکانی رەنج و ئارەزووەمان» دا بڵاو کراوەتەوە. (نووسەر خۆی کورتی کردوەتەوە و کەمێک دەستکاری کردووە.)

تاکوو ئەمسال (1991) هیچ کات ئـەوەم بۆ خۆم دانەنابوو کە لە کاری هونەری دا دەست بۆ رەخنە بەرم. من لام وایە کە کاری هونەرمەندان رەخنەی رووت نیە. بەڵکوو ناوەرۆکی کارە هونەرییەکانی ئەوان خۆی رەخنەیە لە کۆمەڵگا. هونەر خۆی زمانێکی دیاری رەخنەیە.

دەڵێن رەخنە گرینگە چونکە رێگا رووندەکاتـەوە و شەفافیەت دێنێ و جوانی ناسی تازە دەردەخات.من لام وایە گرینگترین رەخنە دەتوانێ خۆی لە تابلۆیەکی هونەری دا ببینێتەوە. بۆ نموونە رۆمانەکانی «دایک» و «نینا» دوو تابلۆی هونەرین و لە هەمان کات دا رەخنەی جیدی لە کۆمەڵگای رووسیە و سەردەمی خۆیانن.

ئێمە وەک مرۆڤی ئەم سەردەمە زۆر شت لە بارەی هونەرەوە دەزانین. ئاگاداری رەوتە زانستی و هونەرییەکانی جیهانین کە هەموویان لە محەکی زەمان و تەجروبە دراون. بۆ نموونە دەزانین کە هونەر خۆی دیاردەیەکی ژیانی کۆمەڵایەتی ئینسانەکانە. هێندێک زەروورەت بوونە هۆی

پەیدابوونی. «پێویستی» و «کار»ی مرۆڤ لە سەرەکی ترین ئەو هۆیانە بوونە.

وەک هەموو دیاردەیەکی‌تری کۆمەڵایەتی، هونەریش تا هاتووە ئاڵوگۆری بەسەردا هاتووە و گەشەی کردووە. شکڵ و شێوە و ناو و ناوەرۆک و رەنگ و رووی تازەی بە خۆیەوە بینیوە. لە جۆرەها «سبک» و «مکتب» دا لە قاڵب دراوە. ئەمرۆش زیاتر لە هەر کات جێگای مشت و مر و نیقاشی زانایان و رەخنەگرانە.

ئەمە وای کردووە کە کێشە لە سەر تاریفی هونەر و شەڕی مکتەبەکان و رەخنە لە ناو و رەوت و رێبازی هونەری زیاتر لە بەرهەمە هونەرییەکان، لاپەڕەی گۆڤار و رۆژنامەکانی سەردەمی ئێمە پڕ کاتەوە.

روون کردنەوەی مێژووی مرۆڤ و کارە هونەرییەکانی، بێگومان کارێکی گرینگ و پڕ بایخە. بەڵام لە هەمان کاتدا کارێک یەکجار قورس و فرە رەهەندی‌یە. شەری مرۆڤ لەگەڵ سرووشت و شەڕی بەردەوامی مرۆڤ لە گەڵ خۆی و لە ناو کۆمەڵگاکاندا، هەر هەمووی لە کارە هونەرییەکانی ئەو دا رەنگ داوەتەوە. دوو دڵی بەردەوامی مرۆڤ بەرامبەر بە پرسی خودا و ترس لە خوداکانی سەرزەوی لایەنێکی هەمیشەیی و بەرچاوی کارە هونەرییەکانی مرۆڤ بووە.

لەگەڵ ئەوەی کە ژیانی مرۆڤ بە قۆناغە مێژووییەکانی «سەرتایی» و «کۆیلەتی» و «فیئودالی» و «سەرمایەداری» دا تێپەریوە، هونەریش وەک دوانەی بیر و خەیاڵی مرۆڤ هەر هەمان قۆناغی تێپەراندوون و رەنگ و رووی ئەو دەورە و زەمانانەی بە خۆوە گرتووە.

ئایا ئەوە بەو مانایە کە هونەریش وەک مرۆڤەکان چووەتە قاڵب و پێگەی چینایەتی‌یەوە ؟ کەم نین ئەو کەسانەی بەڵگە دێننەوە کە هونەر چینایەتی‌یە و لە هەر زەمانێک دا هەر چینێک، هونەری خۆی بەر هەمهێناوە. ژمارەیەک رەخنەگریش دەڵێن کە کلتور و هونەر لە هەر دەورەیەک لە قۆناغەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی‌دا، مۆرک و نیشانەی چینی باڵا دەستی بەسەرەوە دیارە.

بێگومان لە سەرەتادا هونەر ئەم هەمووە ناو و قاڵب و سبک و مەکتەبانەی نەبووە کە ئێستا بوونەتە باری سەر شانی. هونەر وڵامی بە پێداویستیە رووحیەکانی ژیانی مرۆڤ داوەتەوە. لە سەرەتاوە هونەر چینایەتی نەبووە. ئەمەش نیشان دەدات کە دەکرێ لە داهاتووشدا هونەر چینایەتی نەبێ.

لێکۆڵینەوە لە هونەر و تایبەتمەندییەکانی، سەرفی عومرێکی ئازیزی دەوێ. من نە شانس و نە دەرفەتی ئەوەم هەیە کە ئەم کارە بکەم، لە لایەکی دیکەشەوە بە سەدان رەخنەگر لەم بوارەدا بابەتی ورد و پر بایخیان نووسیوە.

ئەوەی کە من دەمەوێ زۆر بە کورتی بە سەریدابێمەوە پێگە و کارکردی هونەرە لە سەردەمی خۆماندا. ئێمە خۆمان لە سەردەمی حوکمروایی سەرمایەداری و دەورەی گولۆبالیزم دا دەژین.

کۆمەڵگا دایکی هونەرە. کۆمەڵگای ئەمرۆ کۆمەڵگایەکی چینایەتی‌یە. مرۆڤ بە پێی شێوەی کار و پێگەی ئابووری خۆی لە ناو ئەم کۆمەڵگایەدا بە سەر دوو لایەندا دابەش

بووه. ئەمەش وای کردووە کە بە گشتی ئەم دوولایەنە شێوەی ژیان و هەست و نیست و حەزو ئارەزوو و بیر و لێکدانەوە و خەون و خولیاکانیان لەگەڵ یەکتر جیاواز بێت. ئاوایە کە هەموو شت لەم کۆمەڵگای چینایەتیەدا بە ناچار ڕەنگ و ڕووی چینایەتی دەگرێ. هونەریش بە گشتی بە داخەوە بێ بەری نیە لەم دابەشبوونە.

پێکەنین یەک شتە، بەڵام لە کۆمەڵگای چینایەتی دا دوو مانای لێک جیاواز پەیدا دەکات، بە پێی ئەوەی کە ئەم کەسەی پێدەکەنێ لە چینی سەر دەستە یان چینی بن دەست. بەڵام من هەرگیز ئەوەم بۆ لێک نەدرایەوە ئەی ئەگەر منداڵێک کە هیچ ئاگایەکی لە جیهانی چینایەتی نیە و پێبکەنێ چۆن تەفسیر و مانا دەکرێتەوە. دەبێ ئێمە چ هەڵسەنگاندنێکی بۆ بکەین؟

دڵخۆشی منداڵ یەک دیاردەیە، بەڵام جیهانی چینایەتی ئەمە دەکا بە دوو و، دوو لێکدانەوەی جیاوازی بۆ دەکات. لەگەڵ ئەوەی کە هەمیشە دەڵێم خۆزگە وا نەبا، سەرم لەم دابەشبوونەی هەستی مرۆڤ بە تەواوی سووڕماوە. من پێکەنین و خۆشی منداڵانم بۆ چینایەتی ناکرێتەوە.

ڕەوتی گەشەی هونەر لە کوردستان خۆی لە خۆی دا باسێکی سەربەخۆیە و کەسی خۆی دەوێ تا لێکۆلینەوە و داوەری لە سەر بکات. بە ڕاشکاوی‌یەوە دەڵێم کە ئەمەش کاری من نیە.

بەڵام من دەتوانم بە کورتی وڵامی ئەم پرسیارە بدەمەوە کە لە دنیای ئەمرۆ دا بۆچی سەدان سبک و مەکتەبی

هونەری بوونیان هەیە؟ ئەم ڕەوت و مەکتەبانە چەندە واقعی و ڕەسەنن؟

من وا بیر دەکەمەوە کە هونەر لە بدایەت و نەهایەتی خۆی دا تەنیا یەک دیاردەی کۆمەڵایەتی‌یە.

من تێناگەم لە ئەو کەسانەی کە پێیان وایە «سەرمایەدار»، «بورژوا» واتە ئەو بازرگانەی کە هەموو شتێک تەنانەت مرۆڤیش بە کاڵا دەبینێ، کە خۆی و خەڵکیش دەفرۆشێ، خاوەن هونەرە. ئەو ملۆزمەی کە مرۆڤایەتی لای ئەو بێ نرخە و بۆ هەست و نیست و حەز و خولیای میلیونان مرۆڤی سەر زەوی بەقەدەر پووشێک ئەرزش قایل نیە، کە بێجگە لە بەرژەوەندی خۆی و  قالب و بەدەنی خۆی هیچ شتێکی دیکە نابینێ، کە خۆپەرەستیەکەی هیچ سنوورێک ناناسێ، من باوەر ناکەم کە هونەری خۆی هەبێ. بە ڕاستی ئەگەر کەسانێک هەبن و پێیان وابێ ئەم بوونەوەرە خاوەن هونەرە یان، شایانی ئەوەیە کە لە هونەر تێبگا، یان هونەر مانا و مەفهومێکی هەیە بۆی، من لەو کەسانە دەکەومە گومان و سەرسووڕمانەوە.

هونەر بۆ چینی سەردەستی کۆمەڵگا ئامرازی دابینکردنی بەرژەوەندی بازرگانانە و مادیی تاک و کۆی خۆیانە. لە ڕوانگەی ئەوانەوە هونەر کەرەستەیە نەک نیازێکی رووحی و دەروونی مرۆڤ. هونەر بۆ ئەوان سۆز و خۆشەویستی و ئارامی و تەبایی و ڕەحم و بەزێیی و هانا و هاوکاری و ئەمەگ و وەفاداری و گوزەشت و خۆبەخشی نیە.

چینی دەسەڵاتدار کە بە داخەوە هەموو ئیمکاناتی چاپ و بڵاوکردنەوە و دەنگ و ڕەنگی خستووەتە ژێر چنگ و

چاوەدێری خۆیەوە، هەموو ئەم ئیمکاناتەی بە هونەریشەوە کردوەتە کەرەستە بۆ درێژەدان بە کاری حوکمڕەوایی و بازرگانی خۆی و لەم ڕێگایەوە سەری لە میلیونان خەڵکی ئاسایی شێواندووە. خۆیشی و هەموو شتێکی تێکەڵاوی گەندەڵی کردووە.

ئەم بازرگانە خۆفرۆشە، لە هەر کوێ بێ، بە هەر زمانێک قسە بکات، هەر ڕەگەزێکی هەبێ، لە هەر تەمەنێک دابێ، تەنیا بیر لە خودی خۆی دەکاتەوە. ئەو بۆ مانەوە لە دەسەڵات و پاراستنی ماڵ و مولک و بەرژەوەندییە مادییەکانی خۆی، هونەریش دەکاتە زەلکاوێک و لە دژی زۆرینەی خەڵک و لە دژی چینی بن دەستی کۆمەڵگا کەڵکی لێ وەردەگرێ. بۆ ئەو بە هەمان شێوە کە ژن و جوانیەکانی ژن کاڵایە، شیعر و پەخشان و تابلۆ هونەرییەکانیش کاڵان. ئەو ناتوانێ جۆرێکی دیکە بیر بکاتەوە. ئەو هەرگیز لە مانای بەختەوەری حەزو ئارەزووی مرۆڤ بۆ بەختەوەی ناگات، نەک هەر ئەوەش بەڵکوو بەختەوەری خۆیشی لە زەلکاوەکانی گەندەڵی دا نوقم دەکات.

ئەگەر لە وڵامی پرسیارەکەی سەرەوە دوور نەکەوینەوە دەتوانم بڵێم کە بیجگە لە ڕئالیسم و ڕۆمانتیسم، هەر هەموو ئیسمەکانیتری هونەر، هەر هەموو سبک و مەکتەبەکانی دیکەی هونەر (کە بە داخەوە زۆریش باون)، تەپلێکی دەنگ بەرزی بێناوەرۆکن.

ناوئاخنی ئەم مەکتەبانە (کلاسیسمی نوێ، ناتۆرالیسم، سمبۆلیسم، سۆنیسم، ئیمپرسۆنیسم، تەجرید، هۆویسم،

کوبیسم، فۆویسم، دادائیسم، ئکسپرۆشۆنیسم، مودەرنیسم، پۆست مدرنیسم و ...) هەرچی بێ، هەرچەندیش وردبینانە، خێرخوازنە، دیموکراسیخوازانە و بەشەر دۆستانە و جیاوازیش بێ، هەر چەند بەڕواڵەت سیمای معترض و دژە دەسەلاتداریشیان هەبێ، نەهایەتەن هەر لە زەلکاوی بەرژەوەندییەکانی چینی سەردەستی کۆمەڵگاوە رۆدەچن و بە سەرلێشێواندنی خەڵک زیان بە بەرژەوەندییەکانی چینی بندەستی کۆمەڵگا دەگەیەنن. ئەوان دەبنە کەرەستەی دابینکردنی بەرژەوەندی بازرگانە فێڵبازەکە.

وردبوونەوە لە ژیان و سەربردەی هونەرمەندان و خوێندنەوەی وردی تاریخ و تەجربەی کۆمەڵایەتی هونەر ئەم وتەیە پشت راست دەکاتەوە کە بازرگانە فێڵبازەکەی ئەمرۆ (کاپیتالیسم)، هونەریشی وەک هەموو دیاردە کۆمەڵایەتیەکانی دیکە تووشی گەندەڵی و بێناوەرۆکی کردووە. لەوانەیە هونەرەکەی رەنگ و روویەکی جوان و بریقەداری هەبێ، بەڵام وەک هەر کاڵایەکی دیکە کە قاڵبەکەی دەیکەیەوە، کە دەچیە ناوی، دەبینی کە بۆنی پووچی و بی بایخی و گەندەڵی تێیدا شەپۆڵ دەداتەوە.

* * *

دوور لەم زەلکاوە، لەم دیوی چیای ژیانەوە، بە درێژایی نزیک بە چوارسەد ساڵ کە لە تەمەنی سەرمایەداری رابردووە، هونەرێکی عامی، خەڵکی، غەیری رەسمی، هونەرێکی بێ ناو بەڵام راستگۆ و پر ناوەرۆک شان بە شانی زەڵکاوی بازرگانەکە هاتووە و رێگای گەشەی خۆی بریوە.

ئەم هونەرە رەسەنە. ئەم هونەرە، هونەری ئینسانی ئازادیخواز، هونەری ئازادیخوازانەی ئینسان، هونەری ماف لێزەوتکراوەکان، هونەری مناڵانی ناو قووڵکەکان، هونەری خەڵکە ژێردەستە و پێشێلکراو، هونەری مرۆڤی خولقێنەر و داهێنەر، هونەری مرۆڤی رەنجدەر و کارگەر، هونەری خەڵکی نەبینراو و سەرکوتکراوە. ئەم هونەرە لەم دیوی زلکاوەکەوە، لەم دیوی گەندەڵی‌یەوە، لەم دیوی چیای ژیانەوە، وەک رووبارێک بە مێژوودا هاتووە و دەور و بەری خۆی بە خولقاندنی ئارەزووی ژیانێکی نوێ بۆ مرۆڤ، نەخشاندووەتەوە.

ئەم هونەرە، گەروو گووشراو بووە و ئێستاش هەر وایە. ئەم هونەرە دەسبەسەر و دەمبەستراو بووە و ئێستاش هەر وایە. گەرچی ناوێکی شیاوی باڵا و ناوەرۆکی خۆی نیە، بەڵام نوێنەری ژیان و تابلۆکانی رەنج و ئارەزوومانە. ئەم هونەرە ئاوێنەی باڵا نوێنی بێ غەوشی ئاوات و ئارەزووکانی چینی بن دەست و چەوساوەیە.

ئەم هونەرە لە جەرگەی کار و تێکۆشانی پڕ رەنج و مەینەتی تاک و کۆی بندەستاندا پەیدا بووە. باسی جوانی و خۆشی و ئەشقی دروستکردن و خولقاندن و باسی رەنج و رەنجەرۆیی وەک دوانەی زگێ، وەک کۆنتراستێک، وەک قەرینەی سروشتی لە تابلۆکانی دا، لە شیعر و پەخشان و لە چیرۆک و رۆمانەکانی دا دەبیندرێن.

ئەم هونەرە کە من ناتوانم و زۆر بۆم زەحمەتە ناوی هونەری چینایەتی لێ بنێم، ئاوێنەی باڵانوێنی کۆمەڵ

و کۆمەڵگایە. ڕاستەقینەکانی تاڵ و شیرینی ئەم ژیانە چینایەتیە، ورد و درشت، چاک و خراپ، سەهل و سادە دەخاتە ڕوو.

ئەم هونەرە هونەری کرێکاری نیە وەک هێندێک ئیدعای بۆ دەکەن. هونەری خەڵکی کرێکار و چەوساوەیە و لە ناوئاخنی خۆی دا دژ بە کاری بەکرێ‌یە. دژی دیلیەتی ئینسان بە دەستی ئینسان و دژی بەکرێکاربوونی مرۆڤە. هونەری ئیعتراز بە ژیان و بەسەرهاتی کرێکاری‌یە. هونەری بێزار لە قەید و بەند و شەرع و عورفی جیهانی ئەمرۆیە. هونەری هاوار لە ژیانی چینایەتی‌یە. هونەری ئارەزووە سەهل و سادەکان و خەون و خەیاڵە هێشتا دوور و ودەی نەهاتووەکانی مرۆڤە.

ئەم هونەرە بێ ناوە، بەڵام پڕ ناوەڕۆکە، بە هێـــز و بزوێنەرە. لە سەرتاسەری ڕەوتی مێژوویی ژیانی ئینسان دا هەر وابووە. نەترس و چاوکراوەیە. ڕاستەقینەیە. وشە بە وشەی شیعر و داستانەکانی کوڵی دڵە و جەگی پێوە چزاوە.

ئەم هونەرە هاندەر و خولقێنەر و دروستکەرە. لە جەرگەی کار و تێکۆشانی گشتی و جەماوەری‌دا پەیدابووە. لە گەڵ ئەوە کە ڕەنج دەکێشێ، بەڵام خۆشی لە، خولقاندن و بەرهەمهێناندا دەبینێ. ئەم هونەرە ریتم و دەنگ و ڕەنگ و کێش و سەروای خۆی لە گەرمەی کار و ڕەنجا دەخولقێنێ.

ئەم هونەرە شاهیدی ڕاستەقینەی ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤە. جێگەی بـاوەرە. لە جیهانی کـار و پێداویستیە

رووحیەکانی مرۆڤەوە سەرچاوە دەگرێ. عەمەلی یە. تەنیا ذهنی نیە.

ئەم هونەرە بەرچاو روونە. خوازیاری گۆرینی وەزعی مەوجوودە. دڵی پڕ لە هیوا و ئارەزووە. پۆزەتیو و کارتێکەر و پێشرەو و دەستپێشخەرە.

ئەم هونەرە ساف و سادەیە. بە زمانی سادەی خەڵک دەدوێ. هیچ لە کەس حاشار نادا و حەقیقەتی ژیان وەک خۆی، وەک ئەوەی کە هەیە دەخاتە روو.

کورت و کرمانجی ئەم هونەرە کە مۆرک و مایەی لە ژیانی چینی ژێردەستەی کۆمەڵگا و ئارەزووە وەدینەهاتووەکانی مرۆڤەوە وەردەگرێ، هونەری کرێکاری نیە، بەڵکوو بە ژیانی کرێکاری و نابەربەییەکانی ئەم جیهانە ناعادلانەیە موعتەرزە. خۆ لە شیعاردان بە دوور دەگرێ و بە راستەقینە پشت ئەستوورە.

خۆشەویستان! برشت و برست و پێشرەوبوون و بە هێزبوونی هونەری ئەمرۆ بەوە ناکرێ کە لە قالبی بدەی. یان ئەوە کە بچی لە پشت ناو و سبک و مەکتەب و ریکلام و شیعار و ئیدەعایێک دا سەنگەر لە خەڵکی دیکە بگری. فارس مەسەلیکی هەیە کە دەڵێ: «مشک آن است که خود ببوید، نه آنکه عطار بگوید.» واتە عەتری باش ئەوەیە کە خۆی بۆن و بەرامەی بڵاو بێتەوە نەک عەترفرۆشەکە ئیدعای بۆ بکات.

چەندە بەرهەم و بابەت و شیعر و گۆرانی و تابلۆکانمان رەنگدانەوەی ژیان و بەسەرهات و خۆزگە و ئارەزووەکانی

خەڵکی چەوساوە و چینی ژێردەستەی کۆمەڵگایە، بە هەمان ئەندازەش شایانی ناوی هونەرە.

من هونەر بە یەک دیاردە دەبینم. دیاردەیەک کە ئەرکێکی مێژوویی لە ئەستۆیە. ئەوە کە هێز و وزە ببەخشێ. یارمەتی مرۆڤ بدات بۆ گۆرینی ژیان لە خراپەوە بۆ باشتر. پاڵ پشتی مرۆڤ بکات لە کاتی تەنگانە و وشیاری ببەخشێ لە کاتی فەرعانە.

وەرن بە جیگای چینایەتی کردنەوەی هونەر، هونەر و هونەرمەندی پەرە پێ بدەین.

# چاوپێکەوتن

## دوو چاوپێکەوتنی تایبەتی ح. شەبەق

حسێن شەبەق، خۆشەویستی و جوانی، دەبێتە شیعر..........

ئەنوەر حسێن - سەمیرە عەلی

وتووێژ لەگەڵ شاعیر و هونەرمەندی شۆڕشگێڕ «شەبەق»..........

گۆڤاری ئەوین - لوقمان ئەیامی

# خۆشەویستی و جوانی، دەبێتە شیعر
# حسێن شەبەق

چاوپێکەوتن : ئەنوەر حسێن - سەمیرە عەلی

## حسێن شەبەق لە زمانی خۆیەوە

کوڕێکی لادێی، لەدایکبووی گوندی زندەری*، ژیانی منداڵی لە لادێ گوزەراندوە، لە لادێ ئاوێتەی ژیانی خەڵک بوە، چوون بۆ ناو مەزرا، بۆ سەرشاخ، بۆ کانی و باخ و بێستان، لەو ژیانە قەرەباڵغەی کە بەیانیان و ئێواران لەگونددا دروست دەبێت، چێژێکی تایبەتییان پێی بەخشیوە و ئاشنایان کردوە بەسروشتی جوانی کوردستان و نزیکبوونی لە سروشت، کاریگەریی زۆریان لە سەر بە جێ هێشتوە، وەک خۆی لە درێژەی گێڕانەوەی بەسەرهاتی منداڵیدا بۆی باس کردین، کە لە ناوەڕاستی گوندەکەیاندا چەمێکی درێژ تێ پەریوە، لەو سەرەوەی چەمەکە باخ و لای خواریشەوە کانی و ئاو و شاخ و کێو هەبوە، لە منداڵیدا زۆر شەیدا بوە، بەو چەمە، کە ون دەبوو، دایکی زۆر بۆی دەگەڕا، کاتێک دەیدۆزیەوە، یا لە سەری چەمەکە، یا لەخواروی دۆزیویەتییەوە، شەبەق بە ماسی و گوڵاو گژوگیا و پەپوولەوە سەرقاڵ بوە، ئەو ژیانە ئەوی کردوە بە بەشێک لە سروشت، بەڵام بۆ خوێندن چووتە شاری مهاباد و خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لەو شارە تەواو کردوە، دواتر چووتە دانیش سەرای کیشاوەرزی

(بەرانبەر بە ئامادەیی کشتوکاڵە) لە نێوان مهاباد و میاندواودا، ماوەی سێ ساڵان لەوێ خوێندویەتی، دواتر شۆڕشی ئێرانی بە سەردا هاتوە، خوێندنگاکەیان تێک چوە و ساڵێکی تر، لە ڕەشت و مازەندەران خوێندوەیەتی، ژیانی دوای شۆڕشی (57)ی ئێران -ڕووخانی شا (1979)- ژیانێکی زۆر تایبەت بوە هەموو شت بەپەلە گۆڕاوە، حسێن شەبەق وەک خۆی ئاماژەی بۆ کرد، ئەو گۆڕانکاریەش کاریگەریی هەبوە لە سەر جۆری بیرکردنەوەی وەک هەر لاوێکی تر ئاڵوگۆڕێکی زۆر قووڵی بە سەر ژیان و جۆری بیرکردنەوەیدا هێناوە، شیعر لە شۆڕشی نزیک کردوەتەوە، شیعر و وشەی کوردی پێشمەرگەیان پێ ناساندوە، لە ڕێی ئەدەبەوە چوەتە ناو سیاسەتەوە.

شەبەق دان بەوەدا دەنێت کە زۆر بەنیازی سیاسەتکردن نەبوە، لەو بارەیەوە بەسەرهاتی خۆی بەم جۆرە گێڕایەوەو گوتی:

پێش ئەوەی ببمە پێشمەرگە و بێمە دەرێ، ناوم لە زانکۆ هاتبوەوە، نمرەی باشم هەبوو، لەو کاتەدا لە دوو دڵی و ڕاڕایدا بووم، کە ئایا بچم بۆ زانکۆ بۆ تاران، یان بچمە ناو شۆڕشەوە، خەڵک ڕووی لە شۆڕش دەکرد، بیرم لەوە دەکردەوە کە ئایا من ئامادەیم هەیە بچمە ناو شۆڕشەوە؟ بۆ ئەوە چوومە لای مامۆستا هێمنی شاعیر، لە گوندی شیلاناوێ، لە ماڵێکی بچووکی هەژارانەدا بوو، ساڵی(1980) بوو مامۆستا هێمن خزممان بوو، بە مامۆستای ژیانی خۆشمی دەزانم، بۆ ئەوەی پرسی پێ بکەم، کە من چی بکەم، لە پێشدا شیعرێکم بۆ خوێندەوە باسی پێشمەرگە کە سەنگەر جێژوانی منە، شتێکی لەو بابەتە شیعرێکی سیاسی بەرەنگاری بوو،

زۆر خاو بوو شیعر نەبوو، زیاتر لە شیعرەوە نزیک بوو، کاتێک کە سەری هەڵبڕی سەیرم کرد دەگری و فرمێسک بە چاویدا دەهاتە خوارێ، پێی گوتم: «حسێن مایەی زۆرت تێدایە» پێشنیهادی کردو گوتی: مەچۆ بۆ زانکۆ، لە زانکۆ هیچ فێر نابیت، ئێستا وەختی چوون بۆ زانکۆ نییە، ئەزانی کێ منی فێری کوردی کرد؟ من دێ بە دێی کوردستان گەڕام، دایە گەورەکان و باوەپیرەکان منیان فێری کوردی کرد، من ئەو زمانەم لەوانەوە وەرگرت، ئەوان زانکۆی من بوون. تۆ ئەگەر دەتەوێت بچیت بۆ زانکۆ بچۆ بۆ دێهات، بچۆ لای دایە گەورەکان، لای باوەپیرەکان، قسەی ئەوانە لە گوێ بگرە» ئەو قسەیە چوە گوێمەوە و ڕەوتی ژیانی منی گۆڕی، من ئاوا هاتم بەرەو پێشمەرگایەتی، ئەو قسانە منی ساغ کردەوە، هەر ئەو کاتە شیعرێکی نووسیبوو لە بن بەڕەکەی دەرهێناو بۆی خوێندمەوە گوتی: «تائێستا نیشانی کەسم نەداوە» تازەیە لەو کاتەدا دوو دێی شاری کوردستانی لای ئێمە قەتڵوعام کرابوون (قاڕنی و قەڵاتان) خەڵکەکەی کوژرا بوون، پاسدار حەفتا هەشتا کەسیان کوشتبوو یان سەربڕی بوو چووبوونە سەریان و کوشتبوونیان، شیعرەکەی ئەمەبوو:

بەهاری کوردەواری سەوز و شینە
لە دەوری تەرمی خوێنین کۆڕی شینە
پێت خۆشە بەهاری کورد ببینی
وەرە گوندی قەڵاتانێ ببینە

دیارە من هەر ئەو دەم نەهاتم بۆ پێشمەرگایەتی، ساڵی (1984) هاتم بۆ پێشمەرگایەتی، بەڵام ئەو قسەیەی مامۆستا

هێمن منی ساغ کردەوە، ئەو دەم ئاڵوگۆڕی سیاسی زۆرم بە سەر هات، وەها مەیدان و دەرگەیەک خولقابوو بۆ خەبات و بەرەنگاریی و کاری سیاسی و پێشمەرگانە، کەم کەس دەیتوانی خۆی لێ لادات، ساڵی (1984) هاتمە ناو کۆمەڵە بەنیازبووم بچمەوە ناو شار لە شانە نهێنینەکاندا کار بکەم، چونکە دوو ساڵان لە شانە نهێنیەکانی ناو کۆمەڵەدا بووم، بەڵام دوایی دڵم پێشمەرگایەتی گرت و نەچوومەوە، کە هاتم ئەحمەد بازگرم دیتەوە، هاو کلاس و کۆنە هاوڕێی خۆم بوو، لە دانش سەرای نێوان مهاباد و میاندواو وانەمان خوێندبوو، ئەو دەم (ئەحمەد بازگر) شیعری دەگوت، منیش ئەو دەم تازە بەتازە شتم دەنووسی، بەڵام بە فارسی دەمنووسی.

## دکتۆر جەعفەری شەفیعی، شەبەق هان دەدات تا بە کوردی بنووسێ

لەبارەی سەرەتای کارکردنی و پێوەندیکردنی بە کانوونی ئەدەبی کرێکاری «گۆڤاری پێشەنگ»، «حسێن شەبەق» گوتی:

یەکەم جار کە هاتم بابەتم دایە کانوونی ئەدەب و هونەر (پێشەنگ) چیرۆکێکی کورت بوو، بیرمە فارسی بوو، چیرۆکەکە بەسەرهاتی ڕۆژێک کرێکاری خۆم بوو لە (رشت) کە لەگەڵ چەند هاوڕێییەکی خۆم کارم کردبوو، کردبوومە چیرۆکێکی کورت، لە بیرمە دکتۆر جەعفەری شەفیعی، کە چیرۆکەکەی خوێندبوە، گوتبووی ئەو کوڕەم پێشان بدەن، ڕۆژێک هات بۆ لام گوتی «زۆر چیرۆکێکی خۆشە دیارە پەلەت تێداکردوە، بەڵام خۆزگە تۆ بە کوردی دەتنووسی»، ئەو قسەیە سەرلەنوێ

هۆشیاری کردمەوە، ئیتر لەو دەمـەوە من دەستم لە فارسی کێشاوە، ئەو دەمیش خەونەکانم بە فارسی بوون، نووسین و خوێندنی فارسی و ئەدەبیاتی فارسی هێندە کاری تێ کردبووم، وەک کەسێک بیرم دەکردەوە و کە هەستم دەڕۆیی و کە خەونم دەدی بە فارسی بوو، هەتا ئێستا من خۆم بەقەرزاربارەی ئەدەب و هونەری فارسی دەزانم، بە ڕاستی زۆر شتیان لێ فێربووم، ئێستایش هەر پێم خۆشە و فارسی دەخوێنمەوە، بەڵام ئیتر لەو ساڵەوە، کە دکتۆر جەعفەر هوشیاری کردمەوە بە فارسی زۆر کەمم نووسی. ئیتر خەونەکانم گۆڕا خۆم بوومەوە بەخۆم، ئەو جار دەتوانم زیاتر تەعبیری خەونەکانی خۆم بکەمەوە.

## شەبەق بۆ تێڕامان لە گوڵێك، ڕیزی پێشمەرگە تێك دەدات

حسێن شـەبـەق خـاوەنـی دڵێکی نـاسک و سروشتێکی ڕۆمانسییە، ئەگەر بارودۆخی کوردستان و میللەتەکەی بەو شێوەیە نەبوایە لەوانەیە هەرگیز تێکەڵ بە کاری سیاسی نەبوایە، هەرسەبارەت بەو سروشتە ناسک و ڕۆمانسییەی خۆی، لە سـەردەمـی پێشمەرگایەتی و شـۆڕشـدا ئـەم بەسەرهاتەشی گێڕایەوە:

دەڵێت: کەوتمە جەرگەی شۆڕشەوە هەر ئەو سەردەمەی کە من هاتم بۆ لای کۆمەڵە، شەڕی سەخت لە ناوچەکاندا لە ئـارادا بـوو، من هەر هۆشم لە سەر خەڵک بـوو، هۆشم زۆر لە سـەر پێشمەرگایەتی نەبوو، ڕۆژێک لە جـولـەدا بووین، بـەرەو شـەڕێک دەچووین، دەبوایە زۆر بە پەلە بڕۆشیتینایە

و خۆبگەیەنینە ئەوێ، لای چەمێک کە پەڕیمەوە بەردێکم بینی کە بە قەوزەیەکی سەوز داپۆشرابوو، گوڵێکی لە سەر بوو، بە دەستی خۆم نەبوو دانیشتم زۆر چاوم لە گوڵەکە کرد، کاتێکم زانی بە جێ مام، هەتا کەسێکم بۆ گەڕاوە و زۆریشم لێ توڕە بوو، گوتی ڕیزی پێشمەرگایەتییەکە دەشێوێنیت بۆ تێڕامان لەگوڵێک؟ مەبەستم ئەوەیە بڵێم کە سروشت زۆر لە سەر من کاریگەر بوە.

## شەبەق حەز بە دانیشتن لە لای پیرێژنان دەکات

هەر وەک پێشتر، هێمن ئامۆژگاری کردبوو حەزی بە تێکەڵاوبوون لەگەڵ داپیرە و باوە پیرەکان بوو، هەر بۆیە لە پێشمەرگایەتیشدا هاتوچۆی لای ئەوانی پێ خۆشبوو، بەسەرنجدان و خوێندنەوەی قووڵ لە هەندێک لە شیعرەکانی هەست دەکەیت کە سوودی لە سەرگوزشتە و حیکایەتەکانی گوێی ئاگردان و ئەفسانەی مێژوویی ناو کەلتووری کوردی و خۆرهەڵاتی وەرگرتوە، لە هۆنراوەی (بە بێ ئێوە)دا ئاماژەی بە ئەفسانەی کۆنی ماروت و قەقنەس وەک گیاندارێکی ئەفسانەیی کردوە، لە کۆپلەیەکیاندا دەڵێت:

با هەر شارە دەرم کەن
من(ماروت)ی هەردانم

ڕازێکم وا لەدڵدا
ئازیزترە لە گیانم

هەروەها لە کۆپلەی کۆتایشیدا دەڵێت:

چـــوون ئـــاشـــقـــم بـــه ئـــێـوەم
لـــەبـــیرتـــان هـــەردەمـــێـــنـــم

(قـــەقـــنـــەس)م گـــەربسـووتێـــم
ڕەســـەنـــتریـــش دەنـــوێـــنـــم

هەر سەبارەت بەو شیعرە بەخۆشی و سەرنجێکی قوڵەوە شەبەق گوتی:

ئەو تۆزە توانایەی کە لە خۆمدا شک دەبەم، کە هەستەکانی خۆم بکەم بە وشە زیاتر چیرۆک و قسەی خۆشی نەستەقی دایە پیرە و باوەپیرەکانە، دیارە دنیای پێشمەرگایەتی ئێمە وەکوو کۆمەڵە زۆر خۆش بوو، دادەنیشتین گۆرانیمان دەگوت، قسەمان دەکرد، شیعرمان دەخوێندەوە، من زۆر جار لە ناو پێشمەرگەدا شیعری خەڵکی ترم خوێندوەتەوە هەموو ئەوانە منی خاراند لەوەی کە دڵم پڕ بێت، شانەی بیرم پڕ بوو، لە وشەی ڕەسەنی کوردی، وەختێک کە دڵت پڕ بوو لە وشە، ئەو دەمە دەتوانیت هەستی خۆشت بهۆنییەوە وەکوو زەنگیانە پێوە بکەی ڕایەڵێکی بۆ ببینیەوە، شیعری (بە بێ ئێوە) زۆر تایبەتە مۆرکی تایبەتی دەورەیەکی سیاسیی ژیانی ئیمەی پێوەیە، ئێمە وەک پێشمەرگەی کۆمەڵە وەختێک شۆڕشی پارتیزانی شکستی خوارد، هاتین زۆرتر لە ئۆردوگاکان ماینەوە، یەکێک لە ئۆردوگاکان ئەو زرگوێزەی ئێستا بوو، زیاتر لە (3000) هەزار پێشمەرگەی کۆمەڵە لەو ناوچەیە کۆ بوە شەڕی ئێران و عیراق تەواو بوو، سنوورەکان بەسترابوو، ئێمە مۆڵەتمان نەبوو بچینە ناوەوە، ئەگەر بچووینایەتە

ناوەوە زۆر بەزەحمەت و نهێنی دەبوایە بچووینایەوە، خەڵک لە تەنگەژەدا بوو، پێشمەرگە چۆن وەک ماسی لە ئاو بکەیت لە خەڵک ببوو، لەو سەردەمەدا بوو مەنسوری حیکمەت ئەو باسی کۆمۆنیزمی کرێکاری هێنایە پێش، ئەو خەڵکە لەو حاڵەتە تاریکەدا بۆ ڕزگاری خۆیان دەگەڕان، دەستیان بەو پەتەوە گرت بۆ ئەوەی بێنە دەرێ لەو چاڵە. کۆمۆنیزمی کرێکاری لەو کاتەدا ڕێگای ڕزگارییەکی درۆینە بوو، بۆ ئەوەی ئەو خەڵکەی کە لێرە کۆ ببوەوە خەریکبوو هیواکانی لە دەست دەدا، خۆی بگوازێتەوە بۆ قۆناغێکی تر، پێشمەرگەی کۆمەڵە کۆچی کرد، ئەو چەند هەزار پێشمەرگەیە وردەوردە بەرەو تورکیا بە ڕێ کەوت، لە کۆتایدا لە ساڵی (1990)دا (47) کەس ماینەوە، من یەکێک لەو (47) کەسە بووم، کە دڵم نەهات ئێرە و پێشمەرگەکان بە جێ بهێڵم، ئەوانەی ڕۆشتن، ڕێگا و بەبیر و باوەڕێکی دیکەیان هەڵبژارد، شیعرەکە مۆرکی ئەو دەمەی پێوەیە، ماروووت لە ئەفسانە کۆنەکاندا هەیە، شیعری (بە بێ ئێوە) بۆ خۆشەویستەکانم بۆ ئەو پێشمەرگانەی کە بەجێیان هێشتم، ئەو خۆشەویستییە لە دڵی مندا گەورەبوو، ئەوان بیروباوەڕێکی تریان هەڵبژارد، دوورکەوتنەوە و ئێمە ماینەوە، ئەوان ئێمەیان بە جێ هێشت، بەڵام من هەرگیز نەمتوانی لەو بازنەی خۆشەویستیەدا بچمە دەرێ، بۆیە پێم گوتن:

بە بێ ئێوە کز دەبم
وەکوو پووشی دارستان،
دەبم بەشمشاڵی کۆن
ناڵەم دەگاتە ئاسمان.

شیعر له ڕاستییەوه سەرچاوه دەگرێت، هەر شیعرێک لەواقیعەوه سەرچاوه نەگرێت ناچێته دڵ، ئەو ڕاستییه هێنده کاری له من کردبوو، ئەو شیعره کاردانەوەی من بوو بۆ ئەو دۆخه، که به سەر مندا هات، که خۆشمی تێدا بەشدار بووم، واقیعێک که چارەنووسی من و هاوڕێکانمی دیاری دەکرد، چارەنووسێک که لێکدابڕانێکی سەختی دا به ئێمه، من لەو حاڵەتەدا نەمدەزانی چی دەڵێم و چی دەنووسم، پێش ئەوەی ئەم شیعره بنووسم هارمۆنی و ڕیتم و مۆسیقای ئەو شیعره خۆشەی بۆ هەڵەبجه نووسرابوو چووبوه دڵمەوه، شیعری (به تەنیا جێم مەهێڵن) وەک هارمۆنی و ڕیتم کاریگەریی ئەوی له سەره، زۆر گریام بەو شێوەی ئەو کاتەی که بەجێیان هێشتم.

## پێشەنگ وەك ونبویەکی خۆشەویستی شەبەق

سەبارەت به گۆڤاری پیشەنگ و کانوونی ئەدەب و هونەری کرێکاری له شەبەقمان پرسی که پێشەنگ چی بوو بۆ تۆ؟ چۆن پێناسەی گۆڤاری پێشەنگ دەکەیت؟ ئایا پێشەنگ توانی ئەو خەڵوەتگه ئارامه بێت هەژان و هەڵچوونەکان و خەونەکانی تۆی تێدا سەوز ببێت، گوتی:

پێش ئەوەی من بێمه ناو کۆمەڵه و کۆڕی ئەو ئەدیبه شۆڕشگێڕانه که پێگەیەنەرانی کانوون بوون، ئەوان کارەکەیان دەست پێ کردبوو، هونەرمەندان و ئەدیبان له زۆربەی شوێنەکانی کوردستانەوه هاتبوون له شوێنێکدا کۆ ببوونەوه، هەست و فیکر و ئارەزووەکانی خۆیان خستبوه سەر یەک، وەختێک ئەوەم دی له خۆشیاندا شاگەشکه بووم، زۆرم پێ خۆشبوو، وەکوو ئەوەی که ونبوویەکی زۆر خۆشەویستی

خۆم دیتبێتەوە، بوارەکەی خۆم دۆزیەوە بە تایبەت کە لەگەڵ ئەحمەد بازگریش پێشتر هاوڕێ و ناسیاو بووین، ئەوەیش زیاتر کاری تێ کردم ئیتر لەگەڵ ئەوانەی کە لە پێشەنگدا پێشتر کاریان دەکرد ئاشنا بووم، لەگەڵ ناسر حسامی و موسلیحی شێخ ئەلئیسلامی، (چاوە) یان فاتحی شێخ ئەلئیسلامی لەگەڵ زۆر دۆست و هاوڕێ و خۆشەویستی تر، وەکوو ئەوانەی لەو بوارە کاریان دەکرد، هەر زۆر زوو ئاوێتەی ئەوە بووم، کە کار بۆ پێشەنگ بکەم، بێجگە لە ئەحمەد بازگر ئەوانی دیکە منیان نەدەناسی، بەڵام بە هۆی ئەو چیرۆکە فارسییەوە ئیتر من چوومە نێو کۆڕی ئەوانەوە، وردەوردە شتی دیکەم نووسی شیعری کورتم بۆ ناردن، یەکەم جار لە بیرمە شیعرم بۆ ناردن بڵاویان نەکردەوە، دوای ئەوەی هەر ئەو شیعرەی بڵاویان نەکردەوە بەپەلە گۆڤارێکی تر بڵاویان کردەوە، تا دەهات زیاتر ئاوێتەی پێشەنگ و کانوون و ئەو کۆڕە هونەریە بووم، دیارە ئێمە هاموشۆمان هەبوو لەگەڵ ئەو هونەرمەند و ئەدیبانەی کە لە دەوروبەری یەکێتی بوون، شێرکۆ بێکەس ئەو دەم بەناوی جوامێرەوە شیعری بڵاو دەکردەوە، دەهات بۆ ئۆردوگاکانی ئێمە لە مالومەو گاپیلۆن و چۆخماخ و ئەو شوێنانەی لێی بووین، دەهات و شیعری بۆ دەخوێندینەوە، شیعری (بەیانی) نووسی بۆ ئێمەی خوێندەوە، ئەو شیعرەی بۆ دکتۆر جەعفەری نووسی بۆ ئێمەی خوێندەوە، ئەوانە هەموویان کاریگەریی خۆیان لە سەر من بە جێ هێشت، ئەو کات کەسێکی ئازاد بووم، من پێشمەرگە بووم خۆم زۆر سەربەست دەدی هیچ چوارچێوەیەک نەبوو من ببەستێتەوە، ئازاد بووم لە شاخ بووم لەگەڵ سرووشت بووم، بە سرووشت گەشتبووم کە گەورەترین خۆشەویستی من بوو، پڕ

بە دڵی خۆم دەمویست بنووسم، بەڵام ژیانی پێشمەرگانە زۆر جار بواری ئەوەی پێ نەدەدایت.

## ئەو وێنەکێشەی بوو بەشاعیر

لە درێژی گفتوگۆکەماندا شەبەق بابەتێکی تری بیر کەوتەوە کە ئەویش کاری وێنەکێشان بوە لە منداڵیدا، کاتێک لە شار بوە وێنەی کێشاوە و شیعری نەنووسیوە، بۆیە گوتی:

باشتێکی دیکەت بۆ بگێڕمەوە. کە لە سەرەتادا باسم نەکرد، کاتێک کە لە قوتابخانە بووم لە تەمەنی (14تا18)ساڵیدا زیاتر وێنەم کێشاوە، وەختێک دەستم لە شار بەربوو ئارەزووکانی خۆم هەڵگرت و هاتم بۆ شاخ، مەودایەک بۆ وێنەکێشان نەمایەوە، لە پێشمەرگایەتیدا، جێگایەک بۆ وێنەکێشان نەبوو، ناچار ئەوەی لە دڵمدا بوو، دەبوایە بە شێوەیەکی دیکە خۆی دەربخات، ئەوەبوو وردەوردە وازم لە ڕەسم هێنا و دەستم کرد بەشیعر نووسین شتێک لە جوودی مندا هەبوو، نەیدەویست بمێنێتەوە خولیایەکم هەبوو، ئەو سەردەمە کە لە شاربووم کە لەئارامیدا بووم ئەو خولیایە بوو بە ڕەسم زیاتر، من کە چووم بۆ نەرویج لە وێ مامەوە زیاتر هۆگری ڕەسم بوومەوە، ئیستاتیکام خوێند، بەڵام پێشمەرگایەتی کە هیچ بوارێکی بۆ نەهێشتمەوە و ئەو کات خۆشم پێی دڵخۆشبووم، ئەو ئامۆژگاریەشم چووبوە گوێ، کە من کوردی لەوێ فێر دەبم، لەو زانکۆیانە کە ڕەنگە هەرگیز ئۆتۆمبێلی بۆ نەچووبێت، لە نێو ئەو خەڵکەی کە ڕەسەنترین دیالێکتی کوردیان هەیە، ئیتر ئەوە ژیانی منی نەخشاند، کە زیاتر ڕوو بکەمە شیعر و زیاتر ڕوو بکەمە پەخشان.

*** یادەوەریەکی خۆش یان ناخۆشی پێشەنگمان بۆ بگێڕەوە؟**

– هەموو شتێکی پێشەنگ بۆ من خۆش بوو، وەکوو چۆن کەسێک خەون بەوەوە دەبینێت کە کەی خۆشەویستەکەی دەبینێت منیش حەزم دەکرد زوو پێشەنگ دەربچێت و چاوم پێی بکەوێت، نەک لەبەر ئەوەی شتی خۆمی تێدایە، هەستم دەکرد زۆر شتی خۆشی تێدایە، پێشەنگ زووزوو دەرنەدەچوو بەداخیشەوە پێشەنگ هەتا دەهات ئەو هاوڕێ و خۆشەویستانەی کە لە دەوری پێشەنگ بوون بڵاو دەبوون، شۆڕش بڵاوی دەکردین، گیان بەختکرد یان چوون بۆ دەرەوە، هەموو ئەوانە کاریگەریان لە سەر من دانا، وەک پێشتر گوتم لە پێکهەێنەرانی کانوون و ئەدەبی کرێکاری و پێشەنگ نەبووم، بەڵام دوایی چوومە ڕیزی ئەو کەسانەی کە لە دەستەی نووسەران بوون، دەتوانم بڵێم من سەرنووسەری پێشەنگ بووم لە ژمارە (13) وە هەتا ژمارە (16)ی پێشەنگ. نەک هەر سەرنووسەری بووم، بەڵکوو دەتوانم بڵێم تەنها من مامەوە کە هەموو کارەکانی پێشەنگم دەکرد، خۆم تایپم دەکرد خۆم مونتاژم دەکرد، وێنەم بۆ دەکێشا و شتم بۆ کۆ دەکردەوە، لە کۆتاییدا دەمهێنا چاپی بکەین، چونکە لە دەورەیەکدا بەرپرسی چاپەمەنی کۆمەڵەش بووم، هەر لەوێ چاپمان دەکرد، تەنانەت لە بەشی فۆتۆگرافیشدا کارەکە هەر بۆ خۆم دەمکرد، ئەو چوار ژمارەیەیی من کارم بۆ کرد، دوایی لە ئاخر ژمارەیدا هەستم کرد سەرکردایەتی ئەو دەمی کۆمەڵە حەزی نەدەکرد شت ئازادانە بڵاو بێتەوە، چونکە لە کوردستانی عیراق و ناوچەکە کەوتبوە کۆتوبەندێکەوە، ئێمەیش سەر بزێو بووین، لەگەڵ خەڵک ئاشنا بووین، قسەمان زیاتر لەوە هەبوو کە پێشتر هەبوو، بەرینایی بەرچاومان، ڕوانگەمان زیاتر لە

دەرەوەی پێشمەرگایەتی بوو، هەوڵمان دا، تائاستێک پێشەنگ سیاسی و سەردەمانە بکەینەوە، هۆشیارییەکی زیاتر لەوەی کە بۆ کۆمەڵە قەبووڵ دەکرا بڵاو بکەینەوە، لە دەورەیەکدا کۆمەڵە لای خەڵکی سلێمانی زۆر خۆشەویست بوو، خەڵک هاتوچۆی دەکردین، بابەتیان بۆ دەناردین، یەکێک لەو خۆشەویستانە لە ساڵی (1985)دا، بوە ئاشنام (سارای فەقێ خدر) بوو، ئێستایش هەر دۆستایەتیمان ماوە، هەموو ئەوانە پێشەنگیان خۆش دەویست، بابەتیان بۆ پێشەنگ دەنارد و پێشەنگ دەوڵەمەندتر دەبوو، ڕێبەرایەتی کۆمەڵە هەستی کرد، لە چوارچێوەی ئیختیار و بیرەکانی ئەو دەچێتە دەرێ، بۆیە ئیتر چیدی یارمەتی پێشەنگی نەدا، ئێمەش دەسەڵاتێکی ماددی ئەوتۆمان نەبوو.

## شەبەق لە پێشەنگدا شیعر، چیرۆک، وەرگێڕان و پەخشانی دەنووسی

*** لەپێشەنگدا شیعر و چیرۆک پەخشان و وەرگێڕانت دەکرد، لە یەك کاتدا شاعیر و چیرۆکنووس و وەرگێڕ و پەخشان نووسیش بووە، سەرەتا بابێینە سەر شیعر بەڕێزتان پێناسەی بۆ شیعر چییە؟**

– من شیعر بە وشە دانانێم، من وەکوو هێمن بیر دەکەمەوە، پێم وا نییە شیعر کۆن و نوێی هەبێت، پێم وایە شیعر چاک و خراپی هەیە، شیعر ڕەنگدانەوەی هەست و شعوری ئینسانە، کە بە وشە دەکەوێتە بەرچاوی خەڵک. هەر ئەندازەیەک ئەو شعور و ئەو هەستە ڕەسەنتر بێت، خۆڕسکتر بێت، پاکتر بێت، چاکتر توانیبێتی لە نێو وشەکاندا جێی خۆی بکاتەوە، بە هەمان ئەندازە دەچێتە نێو خەڵک، دەچێتە سەر دڵی خەڵک، دەبێت بە گۆرانی. باشترین شیعر، ئەو شیعرانەی کە لە ناو خەڵکدا هەمیشە

زیندوون، چونکە چوونە نێو دڵی خەڵکەوە دەبن بە گۆرانی خەڵک لە بیری ناچێتەوە، بە هـەزاران شیعر دەنووسرێت و ڕۆژانە لە گۆڤارەکاندا بڵاو دەکرێتەوە، خەڵک چاوی لێ دەکات و دەڕوات، بەڵام دەیبنی شیعرێک وەکوو بۆمبێک دەتەقێتەوە، زۆر جار دەڵێن شیعری بەرەنگاری کەم تەمەنە لە کوردستان وا نییە، ڕەنگە لە وڵاتانی دیکە وا بێت، من یەکێک لەو کەسانە بووم، کە زۆرترین شیعری بەرەنگاریم گوتوە بە دەست خۆم نەبوە.

*** پێت وا نییە ئەگەر سەردەمێك بێتە پێشەوە بە تەواوەتی کوردستان ڕزگاری ببێت و ئازاد و سەربەخۆ بێت، کە هیچ کێشەیەکی سیاسی نەما ئیدی شیعری سیاسییش ئەو تاموچێژەی نامێنێت؟**

– خۆزگە هەزار خۆزگە، هەزار خۆزگەم ئەوەیە کە ئەو بارە زیادەی ئیمڕۆ خراوەتە سەرشانی شیعر و شاعیران لە کۆڵیان بێتەوە، بگەین بەو دەورە کە شیعر بەوپەری ناسکی خۆیەوە تەنیا بۆ جوانی و بۆ خۆشەویستی خۆی تەرخان بکات.

*** پێت وانییە شیعر وەزیفەیە؟ دەبێت وەزیفەیەکی پێ ببەخشرێت؟**

– من وا بیر ناکەمەوە، من شیعر وەکوو کەرەستە نابینم، ناشیبینم کە وەزیفەیەکی دیاریکراوە و دەبێت هەبێت، بەس هەم شاعیر کە خۆی لە بارودۆخی تایبەتدا دەژی، بە تایبەت ئێمە وەکوو نەتەوەی کورد بارودۆخەکەمان زۆر تایبەتە، بە تایبەتی لەم قۆناغەی ئێستادا، بتەوێ و نەتەوێ تۆ کردەوەیەک وەزیفەیەک کاردانەوەیەکت دەکەوێتە سەر شان، چونکە تۆ ئینسانی ئەو سەردەمەیت، تۆ لە نەتەوەی بندەستی، تۆ بەچاوی خۆت دەبینی کە خەڵک دەچەوسێتەوە، کە خەڵک ژیانی سەختە،

کە هەموو مەوداکانی ژیانیان لێ بەرتەسک کردوەتەوە، ئایا کە کەسێک خۆی بە شاعیر دەزانێت و خۆی بە شعوری بەخەبەرهاتووی ئەو خەڵکە دەزانێت، نابێت هەڵوێستێکی هەبێت؟ ئەی شاعیربوون، ئەی بەهەستبوون، ئەی هۆشیاربوون، بەخەبەربوون مانای چییە؟ پێم وایە باشترین شاعیرانی کورد لەو قۆناغەدا هەر ئەو کەسانەی کە زۆرتر شیعری بەرەنگاریان گوتوە، لەگەڵ ژان و برک و ئازار و خەونەکانی خەڵکی خۆیان بوون، دیارە ئەوە بەواتای کەمتەرخەمی و کەمبایەخدان نییە بەخۆشەویستی، یان بەجوانی پاک یان ڕووت بەو مانایەی کە بڵێین هیچ شتێکی دیکەی پێوە نەلکابێ، ئەگەر لە وڵاتێکی ئەسکەندەنافی بیت، دەبینی کە ئەو شتانە نەماوە، خەڵک ئەگەر شیعر بڵێت تەنها بۆ جوانی دەیڵێت و بۆ دڵی خۆی دەیڵێت، تەنها بۆ خۆشەویستەکەی دەیڵێت، بۆ ئەو خۆشەویستەی دەیڵێت کە ئەمڕۆ خۆشی دەوێت، شیعر هیچ وەزیفەیەکی لە سەر شان نییە، مێژووی هونەر و ئەدەبیاتی نەرویجم خوێندوەتەوە. کاتێک ئەوان خەریکی خۆڕزگارکردن بوون، کە لە لایەن ئەڵمانییەکانەوە لە لایەن بەرەی فاشیستەوە داگیر دەکرێن، شیعری بەرەنگاری لە دایک دەبێت، شعوری شاعیران بەخۆ دەکەوێت، دەبنە دەمڕاستی خەڵکەکەیان، دەبنە ئەو ڕۆحە بەرەنگاریەی کە لە وشەکانیاندا، لە شیعرەکانیاندا خۆی نیشان دەدات و خەڵک دەیکاتە گۆرانی و سروود، لە هەموو وڵاتێکی دنیا وا بوە.

*** پێت وایە شیعر نووسینەوەی هەڵچوون و چرکەساتەکانی شێتی مرۆڤەکان بێت؟**

– ئەگەر چاکم لە بیر مابێت شاملوش قسەیەکی زۆر خۆشی هەیە دەڵێت: «هەموو شتێکی دنیاکەتان شێتانەیە، بێجگە لە

خۆشەویستییە شێتانەکەی ئێوە نەبێت» ئەو قسەیە زۆر پڕ مانایە تەنها شیعر نییە فەلسەفەشە، من زۆرتر لە کاتی نارەحتیدا شیعرم گوتوە، لە کاتێکدا دڵم زۆر پڕ بوە، ئەو کاتانەی کە دڵم زۆر پڕ بوە، وەک چۆن کەسێک بێ ویستی خۆی مەست دەبێت لە سەر خۆی نامێنێت، من وام بە سەر هاتوە، بە دەست خۆم نەبوە، لەو کاتەدا کە من شیعرێکم نووسیوە، نەمزانیوە چی دەکەم، لام وایە ئەوە باشترین کەشوهەوا و بوارێک بۆ لەدایکبوونی شیعرێک دەخولقێت.

*** چی لای شەبەق شیعرە؟**

– خۆشەویستی، جوانی، شێتی، بەرەنگاری هەموو ئەو واقیعانەی دەوربەر کە کار دەکاتە سەر ئینسان، کاردانەوەی ئەوانە و ڕەنگدانەوەی ئەوانە لە شعوری شاعیردا دەبێتە شیعر.

## شلێر وەك شوێنێك لە یادەوری شاعیردا

*** ئایا شوێن ئەو مەنزڵگەیەیە کە شاعیر وابەستە دەکات بەخۆیەوە؟ شیعر گوتن بۆ(شلێر) وەك ناوچەیەك چ مانایەك دەگەیەنێت و چ یادەورەیەکی لای شەبەق جێ هێشتوە؟**

– ناوچەی شلێر، دۆڵ و دەرەو شاخێکی بەرینە، لە نێوان پێنجوێن تا دەگاتە سنووری بانە، سەر بە کوردستانی گەرمێنە کە ئێوەی تێدا دەژین، زیاتر لە (70) ئاوایی و گوند، لەو دەشت و دۆڵانە بوون، بەڵام دەوڵەتی بەعس هەموو ئەو ئاوەدانیانەی ڕووخاند، خەڵکەکەی ڕاگواست و کانییەکانی چیمەنتۆ کرد، بەرلەوەی من بێمە شۆڕشی پێشمەرگانەی خۆرهەڵات، هاوینی ساڵی (1977) من هاتم بۆ پێشمەرگایەتی یەکێتی، گەرچی تازە

فامم دەکردەوە، بەڵام هەستێک هانی دام، تازەش پێشمەرگایەتیی یەکێتی پەیدا ببوو، لەگەڵ برادەرێکی خۆم هەستام لە مهابادەوە هاتین بۆ بانە، دوایـی لە بانەوە بە پێی ڕێکەوتین هاتین بۆ پێنجوێن، کە لە بانەوە بێیتە پێنجوێن، دەبێت بەشلێردا بێیت، ئەو کات لەگەڵ شلێر ئاشنا بووم و چوە دڵمەوە و خۆشم ویست، هەستم کـرد کە وڵاتـی ئێمە چەندە خـۆش و بەرینە! حەوت هەشت ساڵ زیاتر دوای ئەوە چوومەوە شلێر، ئەوسا بە مانگ مامەوە، جاری وا بوو بەتاقی تەنیا من لە شلێر بووم، بەو شاخ و کێوانەدا دەگەڕام و ئەو شوێنانەم دەدیت کە پێشتر خەڵکی لێ بوە، زۆر ئێواران کە بەتەنیا ئاگرم دەکردەوە، دادەنیشتم بیرم لەوە دەکردەوە، کە خۆ ئێرە ئاودانی بوە، خۆ ئێرە خەڵکی لێ بوە، خۆ ئێرە وەکوو گوندەکەی ئێمە پڕ لە دەنگی مەڕوماڵات و سـەگ و مریشـک و جووجکە و منداڵی بچکۆلە و گەورە و ئەو قەرەباڵغیانەی لە گوندەکەی خۆمان بوو بە بیرم دەهاتەوە، ئەوانە زۆر کاریان دەکردە سەر هەست و دەروونی من، ڕۆژێک کە زۆر بەتەنیا بووم، شلێر بێدەنگ بێدەنگ بوو، بەشێکیشی لە گۆشەی ئەو لاوە دەمدی کە خەریک بوو، دارستانەکە دەسووتا. ڕێژێمی بەعس سەرباقی ئەوەی کە خەڵکی ڕاگواستبوو، کانی گوندەکانیشی چیمەنتۆ کردبوو. شەوان تۆپیان دەهاویشت و ئەو تۆپانەش دارستانەکەی دەسوتاند. ئەگەر هەموو شیعرەکەی منت لە بارەی شلێر خوێندبێتەوە، ئەو کات دەزانیت هەستی من چۆن بووە سەبارەت بە ڕاگواستنی خەڵکەکە لەم دەشتە خۆشە. ئەو کات ئەو ئازارە دەبینیت کە لە چۆڵی شلێر و لە تەنیایی خۆمدا لەوێ دیتوومە دەبینی چۆن لە شیعرەکەدا ڕەنگی داوەتەوە. زۆر خۆشحاڵم کە تۆ ئەو شێعرەت دیوە.

## شەبەق لەگەڕانەوەی بۆ کوردستان
## سەگە پیرە بەرەڵاکان دەیهەژێنن

«پلێك گۆشتی ڕانی دزی
زۆر لەمێژ بوو هەتیوی باوك نەدیوی
بۆ گۆشت دەنوزاوە
کەس فرمێسکی بۆ نەدەسڕی»

*ئەم کۆپلەیە لە پارچە شیعری (خەڵکی ماقوڵ)دا هەیە، دەتەوێت باس لە نەهامەتییەکانی چینی چەوساوە و هەژاران بکەیت و ئەو ناعەدالەتییە کۆمەڵایەتییەی کە لە کۆمەڵگادا هەیە؟ باکگراوندی پشت ئەو شیعرە چییە؟

– ئەو شیعرەم لە سلێمانی نووسیوە، من لە دەروونی خۆمدا حاڵ و هەوایەکی پێشمەرگانەم نەبوو، ڕاستە چەکم هەڵگرتبوو، بە شاخەوە بووم و لە ڕیزی پێشمەرگایەتیدا بووم، لە شەڕدا بەشدار بووم، بەڵام ئەوەی منی بەخۆیەوە خەریک دەکرد ژیانی خەڵک بوو، هەڵسوکەوتی خەڵک بوو، من زۆرتر لەوە دەگەڕام من هەمیشە دەمڕوانی، نەمدەتوانی نەڕوانم و چاوم ببەستم، نەمدەتوانی بە سەر شتێکدا تێ پەڕم، هەر ئەم ساڵ کە لە هەولێرەوە بەرەو ئێرە هاتمەوە، شتێک کە زۆر سەرنجی ڕاکێشام کۆمەڵێکی زۆر سەگی پیری بەڕەڵلام بینی کە لە قەراخ جادەکان دەهاتن و دەچوون. کزەم لە جەرگی هات، ڕاستە خەڵکی ئێستا هەژارە، لێرە زۆر بەچاکی دەتوانی جیاوازیی چینایەتی ببینی، فەقیری و

دەوڵەمەندی بە تەواوی دروست بوە، ئەوەی ئەو دەم ئێمە شەڕمان بۆ دەکرد زۆر دیارنەبوو، ئێستا زۆر بەچاکی لە ناو کۆمەڵگای هەولێر و سلێمانی دەیبینی، کە ئەو سەگانەم دیت کە بەپیری و بێ دەسەڵاتی بەرەڵا کرابوون، کتێبەکەی سادقی هیدایەتم وەبیر هاتەوە بە ناوی (سەگی وێڵگەرد) سەگی سەرگەردان مەبەستی لە سەگی سەرگەردان خودی مرۆڤ بوو، لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا کرێکارێک کە پیر دەبێت، کە دەردەکرێن لە سەر کار، کە مەئوایەکی نییە، کە وردەوردە دەڕوات بەبیابانێکدا هەتا ئەو جار داڵ لە سەری دەسوڕێنەوە و دەزانن پیر بوە و کەنەفت بوە و تاقەتی نامەوە، چاوڕێن چاوی لە سەر یەک دانێت و بیخۆن، سادقی هیدایەت کە من بەفەیلەسووفێکی دەزانم ئەو سەردەم کۆمەڵناسەیەکی زۆر قووڵ و بەرینی هەبوە لەو کۆمەڵگایەی کە خۆی تێدا ژیاوە، چارەنووسی سەگێکی سەرگەردان بۆ ئەو چارەنووسی کرێکارێکی بێ دەسەڵات و بێ کارکراوە، من ئەم دوانەم وەک یەک وەبیر هاتەوە، کە وەختێک هاتمەوە کوردستان ئەو شیعرەی سەرەوە کە باست کرد، ئەو شیعرەی سەرەوە کە باست کرد، بە یادی ئەو ژنەم نووسیوە کە لە سلیمانی  پلێک گۆشتی لای قەسابێک هەڵگرتبوو و بە چەندین کەس تێی وەرووکابوون و بە دز دز ئەوەتا دز خەریک بوو چاوی دەرێنن. ژەنەش هاورای دەکرد کورەکەم برسیەتی، باوکی نەماوە، هەتیوە. مانێگێک زیاترە گۆشتی نەخواردوو. هەموو رۆژێ لێرە و لە ناو بازار بۆنی گۆشتی برژاوی بەسەردا بەسەردا دێ.

## شەبەق شیعر بۆ منداڵانی ئەفریقا دەڵێت

* **شەبەق بۆ شیعر بۆ منداڵانی ئەفریقا دەڵێت ئایا هەستە مرۆڤانەکەی پاڵنەر بوە یان وەك بەراوردێك لە نێوان منداڵانی کورد و ئەفریقادا ئەمەت گوتوە؟**

–دیارە من نەچوومەتە ئەفریقا، بەڵام ژیانی خەڵکی ئەفریقا ڕەنگدانەوەی زۆری لە گۆڤار و ڕۆژنامە و تەلەفزیۆنەکاندا هەبوە، لە ناو ئەدەبیاتی کۆمەڵەشدا ژیانی خەڵکی ئەفریقا ڕەنگدانەوەی هەبوە، من زۆر قەرزداری منداڵانم، هەمیشە لە دەروون و ناخی خۆمدا خۆم سەرکۆنە کردووە کە شیعرم بۆ منداڵ نەگوتوە، بەو جۆرەی کە دەبێت ئاوڕم لەمنداڵ نەداوەتەوە، ئێستا کە منداڵم هەیە زیاتر هەست بە دنیای منداڵی دەکەم، دنیای منداڵی زۆر تایبەتە، جا بۆیە من هیوادارم بتوانم ڕۆژێک ئەو قەرزداریەی خۆم جوبران بکەمەوە، دنیای منداڵ پاکترین و خۆشترین دنیایە. لە سەردەمی پێشمەرگەییدا، پێشمەرگە دەچوونە سەرکانی یا لە سەربانەکان ڕادەوەستان، من دەچوومە لای دایەپیرەکان یان لای منالان دادەنیشتم .

## شەبەق کەیفی بە وەرزی بەهار دێت

* **وەرزی بەهار لە دەقەکانتدا زۆر باس کراوە بۆچی؟ زیاتر بەهار بە هیوایەك دەبینی ڕۆژێك دێت کورد بەهاری سەربەخۆیی ببینێت؟**

– هیوادارم بتوانم پێناسەیەکی دەروونی خۆم بکەم بۆچی ئاوا بەهار تایبەتە، من سەرشێت بووم، من زۆر یاخی بووم، لەماڵی خۆمان، لە ناو هاوڕێکانم، لە پێشمەرگایەتیدا

یاخیگەریەکی تایبەت بەخۆم هەبوو، من ئەو یاخیبوونە ئەو نوێبوونەوەیەی بەردەوام لە بەهاریشدا دەبینم، بەهار ژیانەوەیە، دووپاتبوونەوەیە، نوێبوونەوەیە بەبەردەوامی سەوزبوونەوە و ڕواندنەوە سەرلەنوێ، بەهار زۆر گەشە، گوڵەکان لە بەهاردا دەپشکوێن، دەنگە خۆشەکان لە بەهاردا دەبیستی، بۆنە خۆشەکان لە بەهارەوە دێن، لە مێژووی کوردیشدا تۆ تەماشا دەکەیت بەهار تایبەتمەندیەکی هەیە، ڕاپەڕینەکانمان زۆربەی لە بەهاردان، وای لێ هاتوە کە هەموو ساڵێک بەهار دێت دەڵێی خوێنی خەڵکی کورد دەکوڵێت لە بەهاردا، خۆ هەر من وانیم خۆ منیش یەکێکم لەو خەڵکە، خەڵک دێتە دەرێ دەیەوێت ئەوەی لە دەروونیدایە بیخاتە دەرێ، جا بەکردەوە بێت یان بە قسە بێت، بەهار سەری ساڵی کوردییە، نەورۆز خەریکە دەبێتە جەژنی نەتەوەیی ئێمە، ئەو شیعرە خۆشەی پیرەمێردیش زۆر کاری تێ کردووم.

## کاوە تاج بەخشبوو یان تاج فرۆش

*** باش بوو باسی نەورۆزت کرد، بابێینە سەر لایەنە مێژووییەکە بەدەر لە شیعر، بەڕێزتان تا چەند بڕوات بەو ئەفسانەیە هەیە، کە فیردەوسی لە شانامەکەیدا نووسیویەتی و کاوە سەری زوحاکی پان کردوەتەوە؟ بەڕای تۆ کاوە خەباتکەری بە وەفای کورد بوو یان خیانەتکار؟**

– دیارە ئەو شتەی فێردۆسی لە شانامەدا نووسیویەتی ئەوەی لە مێژوودا هەبوە و ئەوەیشی کە شاملو لە سەر ئەو مێژوە نووسیویەتی، کاتی خۆی ناسری حیسامی شتێکی لە

سەر ئەوە بڵاو کردەوە، ئەوانەم خوێندوەتەوە و دیتوە، من نەمتوانی لە نووسینەکەی شاملودا ئاڵوگۆڕێک لە بیر و مێشکی خۆمدا پێک بهێنم و باوەڕ بە ئەوە بکەم کاوە پیاوێکی خراپ بوە و زوحاک پیاوێکی باش بوە.

*** تۆ لەوبڕوایە دایت کاوە تاج بەخشبووبێت یان تاج فرۆش؟**

-من پێم خۆشە هەر ئاوها بمێنێتەوە ئەو خەونمان لێ تێک نەدات، کاوە ڕزگاریکەر بوە، ئازادیخواز بوە کۆکەرەوەی هەموو ئەو کورە ئازایانەی بوە کە لە بەردەستی زوحاک ڕزگاری کردوون.

*** گومانمان لەوە نییە. بەس بۆ کاتێك تاجەکەی لە سەری زوحاك داگرت پێشکەشی کوردێکی نەکرد؟ بە بڕوای من گەورەترین دەوڵەتی کوردی لە سەر دەستی کاوەدا لە ناو چوە!**

– ڕەنگە تۆ خویندنەوەت لە من وردتر و زیاتر بێت لەو بارەیەوە، من زۆر ورد نەبوومەتەوە، نەمویستوە ئەو خەونەی خۆم ئاڵۆز بکەم، کە کاوە ئینسانێکی ڕزگاریخواز و ئازادیخواز بوە، لەو سەردەمەی خۆیدا، چیرۆکی کاوە لە دەوروبەری مهاباد، دەوروبەری شارەکەی من ئاسەواری (شار وێران) ئێستایش هەر ماوە، بەڵام لێکۆڵینەوەیەکی ئەوتۆی لێ نەکراوە، ئەوەی کاوە ئەو کارەی کردوە خۆ یەکەم جار نییە کە کورد کیانی خۆی پێشکەش بەخەڵکی دیکە دەکات، سەلاحەدینیش هەروای کردوە، وەختی خۆی کە ماددەکان یەکەم دەوڵەتی کوردیان پێک هێناوە، لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستەوە تا دەگاتە، ئەو وڵاتەی کە پێی دەڵێن ئێران هەر زۆر زوو فارسەکانیان هێناوەتە ناو بارەگاکانی خۆیان.

*** ئەگەر ئەو ئەفسانەیە هاوتەریبی بکەیت بەواقع زوحاك ئاخر پاشای مادبوە واتە ئستیاجس بوە؟**

– دیارە من مێژووم زۆر خوێندوەتەوە، بەڵام ڕەنگە نەتوانم خۆم ڕازی بکەم بەوە کە وەڵامی ئەو پرسیارە بدەمەوە.

*** من ئەو پرسیارەم لە زۆر کەسی تر کردوە، کەس دڵی نایەت ئەو خەونە یان یۆتۆپیا تێك بدات، هەموو بە خەونێکی خۆش دەزانێت؟**

– شاملو قسەیەکی خۆشی هەیە دەڵێت: «کاتێک کە خەڵک وشەیەکی بە هەڵە بە کار هێنا، یەکەم جار تا وشەکە بڵاو نەبوەوە، دەتوانی پێشی پێ بگری ئەو وشەیە ڕاست بکەیتەوە، بەڵام کاتێک زیاتر لە یەک ملیۆن ئینسان وشەیەکیان بە هەڵە بە کا رهێنا، تازە ئەو وشەیە جێی خۆی دەگرێت» ئەمە بۆ ئەو مێژوەش هەر ڕاستە، تازە تۆ ناتوانی ئەوە لە خەڵک بسێنیەوە، چونکە خۆڕاهێنانی تێدایە، فێربوونی تێدایە، خۆسازکردنەوەی بۆ داهاتووی تێدایە، لە چیرۆکی حەزرەتی ئیبراهیمدا، دەڵێن ئیبراهیمیان گرت و لە سەر ئەو باوەڕەی کەبتەکانی شکاند بوو، ئاگریان بۆ کردەوە خستیانە ناو ئاگر، بەس ئەفسانەکان پێمان دەڵێن ئیبراهیم نەسوتا، ئیبراهیم چوو بۆ ئاسمانەکان، خەڵک پێی خۆش نەبوو ئیبرایم بسووتێت، چونکە خۆشیان دەویست، بۆیە ئەو ئەفسانەیەیان بۆ دروست کرد کە ئیبراهیم ناسوتێت، یان عیسا کە لەخاچ درا، لە سەر باوەڕەکانی خۆی، بەس خەڵک ئەو ئەفسانەیەی دروست کرد، کە عیسا ژیاوە و سەرلەنوێ ژیانی بەبەردا هاتەوە، ئەو ئەفسانەیە لە خەڵک بستێنەوە خەڵک دەڕوخێت هیواکانی هەرەس دێنێت، ئەوە تاوانێکی گەورەیە کە بمانەوێت دەست بۆ ئەوە بەرین.

*** بەس تاکەی ئێمە خەونەکانمان لە سەر یۆتۆپیا بنیاد بنێین؟**

– یۆتۆپیا یارمەتیمان دەدات، یۆتۆپیا مەحاڵمان بۆ دەکات بە واقیع ، یۆتۆپیا دەتوانێت کاری کارستان بکات، کارێک کە بە هیچ کەس ناکرێت، دەتوانێت بە کەسێکی زۆر سادە بیکات، هەر یۆتۆپیا دەبێتە واقیع، پێشتر مرۆڤ خەونی بە فڕینەوە بینیوە، جا دوای ئەوە توانیویەتی بە ئاسماندا بفڕێت، خەونی دیوە کە بن دەریاکان چی تێدایە نازانم چیرۆکەکانی (ژۆلڤرن)ت خوێندوەتەوە؟ نووسەرێکی فەرەنساوییە، ژۆلڤیرن قەد لە ژیانیدا نەگەڕاوە، بەڵام سەفەری بۆ سەر مانگی هەیە، سەفەر بۆ ناو دەریای هەیە، سەفەرێکی بەدەوری زەویدا هەیە، لە خەونەکانی خۆی دا دەڕوات بەدەوری زەویدا و خەڵکت پێ دەناسێنێت، لەگەڵ خەونەکانی خۆی دەچێتە بن دەریا و دەریای پێ دەناسێنێت، ئامێری جۆراوجۆر دەناسێنێت، لە کاتێکدا شۆڕشی پیشەسازی دەست پێ دەکات لە ئورووپا لە سەدەی (17)، ئەو دەمە کۆمەڵگای بەشەری دەتوانێت ئەو خەونانەی ژۆلڤیرین بە دی بهێنێت و ئەو شتانە دروست بکات، یەک کاری خراپ کە ئەدەبیاتی سۆسیالیست کردی، کە خەونی پاک کردەوە، زۆرتر هەوڵی دا، کە واقیع نیشان بدات، ڕەخنە لە واقیع بگرێت، کە پێی دەڵێن سۆسیالستی ڕەخنەگرانە، یۆتۆپی لە سیاسەتدا لەگەڵ یۆتۆپی لە دەروونی ئینساندا جیاوازی زۆرە، (لەنگستی هیوز-Langston Hughes) شاعیرێکی ڕەشپێستی ئەمریکایە پێمان دەڵێت: "خەونەکانت لە دەست مەدە، ئەگەر بێت و خەونەکانت لە دەست بدەیت، هیچ شتێکت نابێت بۆی بژی".

*** کەواتە ئێمەش بەو شێوەیە لە کاوە بڕوانین؟**

– من پێم وایە ئەو شانازی و سەرکەوتنەی لێی نەسێنینەوە، ئەو ئازایەتییەی کە بەجوانی لێ هاتۆتەوە، خەڵکیش ئەو خولیایەی

کە چۆتە دڵی دەبینی لاوێکی شۆڕشگێڕ گوێ لەو چیرۆکە دەگرێت، پێی خۆشە، خۆی تێدا دەبینێتەوە، هەستی شۆڕشگێڕی و بەرەنگاری تێدا زیاتر دەبێت، هەستی ئازادیخوازی تێدا زیاتر دەبێت، مادام ئەو چیرۆکە و ئەو ئەفسانەیە فێری ئازادیخوازیمان دەکات، غەدرە ئەگەر لە مێشکی خەڵکدا بیشۆینەوە.

بەڵام هاوکات لە باری کلتورییەوە، با کارێک بکەین کە کاوەکانی داهاتوومان بۆ رزگاری و سەربەخۆی خەڵک و نەتەوەکەی خۆیان هەوڵ بدەن نەک ببنە پردەبازی داگیر کەران. کاوەکانی ئەمرۆی کورد پێویستە دەوڵەت بۆ خۆیان، بۆ کورد دروست بکەن، نەک دەوڵەت بۆ فارس و تورک و عەرەب رێکبخەنەوە. ئەمڕۆ ئێمە پێویستمان بە کاوەی قارەمان و هاوکات زۆر تیژ و وشیار هەیە .

## شەبەق: شیعر زیاتر لە هەر شۆڕش و شۆڕشگێڕێك خزمەتی بەکورد کردوە

*** هەر چەندە لە بوارەکەی خۆمان دوورکەوتینەوە کە شیعر و ئەدەب بوو، با بێینەوە لای شیعر، با بزانین تا چەند خزمەتی بەنەتەوەی کورد کردوە؟**

– زیاتر لە دەساڵە بەوە گەیشتووم کە وشە، شیعر و گۆرانی زیاتر لە هەر شۆڕشگێرێک و هەر شۆڕشێک خزمەتیان بەنەتەوەیی کورد کردوە، شیعر ڕابردووی ئێمەی پاراستوە، بواریان ڕەخساندوە بۆ لێکۆڵینەوە لەو ڕابردوەی کە بوومانە، ئەگەر (توحفەی مزەفەریە) چاو لێ بکەی کە هێمن کۆی کردوەتەوە، ئۆسکارمان نووسیویەتی گەڕیدەیەک بوە، کە هاتوەتە شاری

مهاباد و کابرایەکی بە ناوی (حەمەی بەیتان) دیوە، ئەو بەیتانەی بۆ گوتوە، ئەو لە سەر گرامەفۆن تۆماری کردوە، وەختی خۆی دکتۆر قاسملو لە مۆزەخانەی بەرلین ئەو گرامافۆنە دەدۆزێتەوە و نوسخەیەکی دەدات بە هێمن کە سەرلەنوێ دای دەڕێژێتەوە و دەینووسێتەوە، ئۆسکارمان وەک مێژووناسێک دوای دنیای خۆی کەوتوە، کە لێکۆڵینەوە دەکات، بۆ نموونە چیرۆکی زەمبیل فرۆشی لێک دەداتەوە بیر لەو کەرەسانە دەکاتەوە کە ئەو دەم کورد بە کاری هێناوە، بیر لەو چەکانە دەکاتەوە کە شەڕی پێ کردوە، بیر لەو کەلتوورە و هەڵسوکەوتە کۆمەڵایەتییە دەکاتەوە کە ئەو دەم بوە، لەوە دەکولێتەوە کە ژنسالاری لە کۆمەڵگای کوردەواریدا بوونی هەبوە، بەڵام بۆ ئێمە بەیت و باوەکانی و هۆنراوەکانی ئەو قەڵا مێژووییە قایمانەن کە گەلەکەمان و زمان و کەلتوورەکەمانی پاراستووە. زمانەکەمان بەشی زۆری شیعر و بەیت و باوە، لەوەدا زۆر دەوڵەمەندین تەنها لە فەرهەنگی کورددا قسەی نەستەق زۆرە، شیعر زیاتر لە هەر تۆبخانەیەک، زیاتر لە هەر شۆڕشگێڕێک، زیاتر لە هەر شۆڕشێک خزمەتی بەکورد کردوە تا ئەمڕۆ.

## شەبەق چیرۆك و پەخشانیش دەنووسێت

*** وەك گۆران دەڵێت: «ئەو خەیاڵەی پێی مەستم**
**بۆم ناخرێتە چوارچێوەی هەڵبەستم»**
**شەبەقیش ڕەنگە لەو ڕوانگەیەی کە هەندێك خەیاڵ مەستی کردبێت، بەڵام نەیتوانیبێت لە چوارچێوەی شیعرێکدا دای بڕێژێت ئایا ئەو خەیاڵاتانەی هەندێك جار هەتبوە، نەتتوانیوە بیخەیتە قاڵبی شیعرەوە، بۆیە لە قاڵبی پەخشان یان چیرۆکدا دەرتبڕیوە؟**

- ڕەنگە هەر من وا نەبم، پێم وایە زۆر لە شاعیران یان هونەرمەندا هەر وان، جاری وایە لەگەڵ واقعێک ڕووبەڕوو دەبن، پێم وایە ئەو واقیعە گەورەترە لەوەی بچێتە چوارچێوەی شیعرەوە، پەخشان مەودایەکی گەورەترە لە شیعر، بیرمە کە یەکەم جار کەسێکم خۆش ویست نەمتوانی شیعری بۆ بنووسم، نەمتوانی نامەشی بۆ بنووسم و دوو قسەشی لەگەڵ بکەم، بەس پەخشانێکم بۆ نووسی.

*** دەقێکی ئەدەبیت هەیە بەناو سێ وێنە، پێك هاتوە لە بەهار، زیندان، گوڵدان، لە یەك کاتدا چیرۆك ئامێزەو پەخشان ئامێزیشە، کامیانە؟**

- پەخشانە، بەڵام بۆنی چیرۆکی لێ دێت، وێنەی بەهارە، کە خوێندکارێکی کچ لە ناو پۆلدا دارشتنێک دەخوێنێتەوە لە بارەی بەهارەوە، دەڵێت: بەهار دەبێت چاوەکانی شین بێت، وەکوو شیرکۆی برام، بزەی هەمیشە لە سەر لێو بێت، وەکوو سەوزفرۆشەکەی ئەو بەر شەقام، دەبێت پرچەکانی زەرد بن، وەکوو پرچەکانی پورە کوبرام، بەڵام بەهار وەکوو شیرکۆی برام پزیشکی خۆمپارەی بەرنەکەوتوە، وەکوو سەوزەفرۆشەکەی ئەوبەر شەقام، ڕەنجی فەقیری و هەژاری کۆمی نەکردوە، وەکوو پورە کوبرام دەستی وەبەر دەزگای پارچەچنین نەکەوتوە. لێرەدا دوو شتی دژ بەیەک دەبینی ڕەش و سپی، ناحەز و جوان، کە ئەو دژیاتییە کە من بیری لێ دەکەمەوە، من ئەو ئازارانەم دیوە بەچاوی خۆم، دوور لە یەکتر، بەڵام لێرەدا کۆم کردوەتەوە بۆتە پەخشانە شیعر کە وەختی خۆی نەمتوانیوە بیکەمە شیعر دیارە ئەوانە بۆ من گەورەتربوون لە شیعر، سەرەنجام خۆیان لەوێدا

بینوەتەوە، لە (گوڵدان)دا ویستومە وێنەی جوانی دنیای منداڵ بنەخشێنم، کە منداڵ چ دنیایەکی جوانی هەیە، دنیایەکی پاک و مەعسومی هەیە، ئەو دنیایە بەبێدنگی بە جوانییەکەی خۆیەوە بانگمان دەکات کە ئێمەش وەکوو ئەوان بین، خۆزگە ئێمە لە منداڵان شت فێر بووینایە.

*** چیرۆکە پەخشانی گوڵدانت لە چ سەردەمێك و چ کاتێکدا نووسی، چی پاڵی پێوە نایت ئەو جوانییەمان بەم جۆرە بۆ بەیان بکەیت؟**

– دیارە گوڵدانم درەنگ نووسیوە، بەڵام ڕووداوەکەیم زووتر بینیوە، ساڵی (1981) ئەوەم دیوە لە شارەکەی خۆمان، مهاباد ماوەی یەک مانگ بەر تۆپخانە کەوت، ئێمە لە ناو شاردا بووین وەک خەڵک، بەڵام دەوڵەت بە تۆپ لە شارەکەی دەدا، بە تۆپی تانگ لە کوچە و لە کۆڵانەکان لە خەڵکیان دەدا، بە چاوی خۆم دیومە کە دوو منداڵ قاوانە فیشەکی گەورەیان هێناوەتەوە، پێیان هەڵنەگیراوە داوای یارمەتییان لە خەڵکی دیکەش کردوە، لێیان پرسیون چی لێ دەکەن، گوتویانە دەیکەینە گوڵدان، دیکتاتۆرێک ئەوە وەک کەرەستەی شەڕ بە کار دەهێنێت بۆ کوشتن و وێرانکردن، بەڵام منداڵ بە دنیای خۆیەوە تێمان دەگەیەنێت، کە دەکرێت ئەوە ئینجانەیەک بێت بۆ گوڵێکی جوان، بۆیە دەڵێم خۆزگە ئێمە لە منداڵەوە شت فێر بووینایە.

*** ئەی باکگراوندی پشت کورتە چیرۆکی مامەی نەفتی چییە؟**

– مامەی نەفتین خەڵکی گەڕەک و کوچەی ئێمە بوو، بەمنداڵی زۆر جار دیتومە هەستم بۆی بزواوە وەکوو منداڵێک دیومە لە ناو بەفر و سەغڵەت و نارەحەتیدا، کە چۆن ئەو چەلەنگە نەوتانە

هەڵدەگرێت و چ ڕەنج و زەحمەتێک کار دەکات، دیومە کە منداڵ لێی ترساوە، ئەوەندە ڕەنجی کاری تاقەتپڕوکێن بە ڕوویەوە دیار بوو، کە دەموچاوی ئاڵۆسکاوە، لە حاڵەتێکدا دڵێکی گەورە و پاک و جوان و بەرینی هەبوە.

*** وەك تەكنیك و نــاوەرۆك كاریگەریی چ چیرۆكنووسێكی ئەو سەردەمەت لە سەر بوە؟**

– زۆرتر دەتوانم بڵێم مەکسیم گۆرگی، دەتوانم بڵێم هەموو شتەکانیم خوێندوەتەوە، زۆر شەیدای مەکسیم گۆڕگی بووم، ئێستایش هەوڵ دەدەم چیرۆکی کورتی مەکسیم گۆڕگی پەیدا بکەم و بیکەم بە کـوردی، خوێندنەوەی ئـەو چیرۆکانە ئەو مـەودایـەی بۆ خولْقاندم کە بیر لە واقیع بکەمەوە، واقیع لە هەموو شتێک گەورەترە، ئەگەر ئینسان بتوانێت وەکوو خۆی بینەخشێنێتەوە، دیارە مەبەستم بەهەستی خۆی، چونکە ناتوانیت واقیع وەکوو خۆی دروست بکەیتەوە هەمیشە هەستی خۆتی تێکەڵ دەکەیت، چەند لە واقیع نزیک بینەوە ئەوەندە لە شاکار نزیک دەبینەوە.

*** بە پێی ئەو چەند ساڵەی لە وڵاتی نەرویج دەژیت تاچەند ئاگاداری ئەدەبیاتی نەرویجیت، ئایا هیچ كاریگەرییەكی لە سەرت بە جێ هێشتوە؟**

– نەرویج دوو کەڵەنووسەریان هەیە کە لە مێژوودا زۆر بەناوبانگن، یەکێکیان لەبەر ئەوەی زمانی نەرویجی دەوڵەمەند کردوە، بەناوی (Knut Hamsun) کنوت هامسۆن لە ژیانی خۆیدا دەبێتە فاشیست، دەبێتە دۆستی هیتلەر بەو حاڵەشەوە خەڵک بە ئەمەک بوە دەرهەقی، شتی خۆشی نووسیوە هێندە

زمانەکەیانی دەوڵەمەند کردوە ئەوان ناتوانن حاشای لێ بکەن، لە باوەشی خۆیاندا وەکوو نووسەرێکی گەورە پاراستویانە.

یەکێکی تر لەو نووسەرانە دەتوانم بڵێم نەک هەر بۆ نەرویج، بەڵکوو بۆ دنیا گرینگە، هنریک ئەپسنە، بەشکسپیری ئەسکەندنافیا و نەرویج ناسراوە، ئەپسن پێش شەڕی یەکەمی جیهانی ژیاوە، شەڕی جیهانی نەدیوە، دنیای نوێ و سەدەی بیستەمی بە چاوی خۆی نەدیوە، مۆدێرنیتە و فێمێنیزمی نەدیوە، دنیای پێشکەوتوو خەباتی ژنانی نەدیوە، پێش ئەوەی خەڵک هۆشیار بنەوە، هەستی بە ژن کردوە، چیرۆکێکی هەیە ئەو چیرۆکەی وا ئەپسنی بەناوبانگ کرد، لەو چیرۆکەدا وەک نووسەرێک قسە ناکات وەک فەیلەسووفێک قسە دەکات، لەو ڕۆژەوە یاخیبوونی ژن لەو چیرۆکەدا لە لایەن ئەپسنەوە دەست پێ دەکات، سەبارەت بەکاریگەرییش من کۆمەڵێک چیرۆکی نەرویجیم داناوە، وەریان گێڕمە سەر زمانی کوردی.

*** بەو پێیەی ڕشتەی ئیستاتیکات لە کەلتووردا خوێندوە، تاچەند کەلتووری کوردی خاوەنی ئێستاتیکایە؟**

– کەلتووری کوردی زۆری تێدایە، ئێمە خۆرهەڵاتمان هەیە هیچ حەقیقەتێک لە ڕۆژ گەورەتر نییە، ئێمە لێرە ڕەنگەکان بە جوانی دەبینین لە ئەسکەندنافیا ئەو ڕەنگانە وا نابینی، خەڵک فێری ڕەنگی چڵکن بوە، یەکێک لەو ڕەخنانەی کە من لە هونەرمەندانی ئەوێ هەم بوو، وەکوو ئەندام لە کانوونی وێنەکێشانی ئەو شارانەدا هەم بوو، هەموویان ڕەنگی خۆڵەمێشی و ڕەنگی شینی تۆخ و ڕەنگێکی بنەوشەی تێکەڵ بە ڕەش بە کار دەهێنن، ئەوانە ڕەنگی قورسن ڕەنگی خەمن، ڕەنگی تەماوین،

دەیانگوت ئەو ڕەنگانە زۆر جوانە، چونکە ئێمە هەر ئەو ڕەنگانە دەیبینین، دواتر بۆم دەرکەوت ئەوان وەک ئێمە ڕۆژیان وەکوو حەقیقەتێکی گەورە نەدیوە، کارتێکردنی ئەو ئاووهەوایە کە تێیدا گەورە بوون، ڕەنگدانەوەی کارەکانیانە، وەختێک من وێنەیەکم دەکێشا لە ناو سەد تابلۆی تردا دیاربوو.

## ئەو شاعیرەی بوە بەوێنەکێش

شەبەق کاتێک لە وڵاتی ئاوارەیی و غەریبی جۆرێک لە ئارامی و نیشتەجێی بە خۆیەوە دیت، دەستی دایەوە وێنەکێشان. وەکوو خۆی دەڵێت:

هەر کات کە هەستم بە ئاسایش کرد و زانیم ئیتر ئەوەماڵێک و جێگا و ڕێگایەک هەیە، زیاتر لەوەی ئاوڕ بدەوە لە شیعر، ئاورم لە وێنەکێشان دایەوە، لە نەرویج لە چوار پێنج پێشانگادا بەشداریم کردوە، پێشانگایەکم لە شارەکەی خۆمان لە کتێبخانەی گشتی کردەوە کە لە ماوەی مانگێکدا زیاتر لە شەش هەزار کەس سەردانی کرد، دەفتەرێکم دانابوو بەزمانی فارسی و کوردی و عەرەبی و نەرویجی، ئەو دەفتەرم هەڵگرتوە، وەک یادگاریەکی جوان، سێ پێشانگام بە تەنیا کردوەتەوە، لە سێ پێشانگای هاوبەشدا لەگەڵ خەڵکی تر بەشداریم کردوە، تابلۆیەکم کێشا لە زانکۆی خۆمان لە ناو پەنجا خوێندکاردا تابلۆکە یەکەم هاتەوە. ساڵی (2006) بوو. (بێجگە لە من و کوڕێکی چینی و کچێکی ویێتنامی ئەوانەی دیکە هەموویان نەرویجی بوون) هێندێک لەو خوێندکارانە مامۆستای قوتابخانە و زۆر لەمن زانا تر بوون

و کلتور و مێژوی وڵاتی خۆیان چاک دەناسی. من کارێکم کردبوو یەکێک لە مامۆستاکانمان زۆر سوپاسی کردم گوتی: «تۆ پۆلەکەی ئێمەت بردە، ئاستێکی دیکە» من کارێکم کردبوو بە بێ ئاگایی خۆم نزیکبوو لە کاری وێنەکێشی ناوداری نەرویجی ئیدوارد مونگ، لە نزیک ئەو شارەی کە من لێی دەژیم ماڵەکەی بۆتە مۆزەخانە، ئیدوارد مونگ لەگەڵ دوو وێنە کێشی بە ناوبانگی دیکەی ئەورووپای بۆ خۆیان ڕێبازێکیان دانا، ئەو دوو کەسە یەکێکیان (ونستۆن وانگۆگ) ئەوی تریان (گوگن)ە، ئەو سێ کەسە لە ڕاستییدا کۆتاییان هێنا بە هەموو ڕەوتە کلاسیکییە کۆنەکان، ڕەوتێکی تازەی گرینگیان لە وێنەکێشان لە دنیادا دانا، لە دەرەوە پێی دەڵێن (ئیکس برۆشۆنیزم) واتا دەرخستنی دەروونی خۆت، بەڵام ئیدواردو هاوڕێکانی وێنەکێشانیان هێنایە دەروونی خۆیان، بۆ نموونە هاتوون خۆشەویستی، تەڵاق، جودایی، گریان، حەسودی،نەخۆشیان بە وێنە کێشاوەتەوە. بە بێ ئەوەی شەرم بکەن هاتوون ناخی خۆیان  دەرخستوە، منیش پێش ئەوەی لەو ڕێبازە بگەم ئەو کارەم ئەنجام دا، من لە خۆم نەدەگەیشتم، بەڵام مامۆستاکان لە من دەگەیشتن.

*** لە کۆتاییدا چ تێبینییەکت یا پێشنیارێکت لە سەر ئەدەبیاتی ئێستا هەیە؟**

–بەداخەوە وەک تۆش بۆت دەرکەوت زۆر دوورکەوتومەتەوە لەو کەشە ئەدەبیەی لە کوردستانی خۆماندا هەیە، بەڵام من گەشەیەکی یەکجار بەرین دەبینم چ لە نووسین و چ لە ئەدەبیات، شتێک چونکە ئێستا ئێمە لە ناوەندیداین بە چاکی نایبینین.

# وتووێژ لەگەڵ شاعیر و هونەرمەندی شۆڕشگێڕ «شەبەق»

ئامادەکردنی : لوقمان ئەیامی
گۆڤاری : ئەوین*

شەبەق شاعیر و هونەرمەندی بەرەی بەرەنگاری و شۆڕشە. لە ساڵی (1961) لە خۆرهەڵاتی کوردستان لە نزیک مەهاباد لە دایک بوە. لە هەرەتی لاوێتیدا ڕێگای شاخی گرتوەتە بەر، ئەزموونی شاعیری خۆی لە گەرمەی شەڕی بەرەنگاری کورد دژی داگیرکەران و شان بە شانی پێشمەرگە و کۆمەڵانی خەڵکی زەحمەتکێش تێپەڕ کردوە. خاراوی کوورەی شۆڕش و بینەری دەیان حیماسە و بەسەرهاتی تاڵ و شیرینی خەڵک و پێشمەرگە بوە. هونەری ئەو ڕەنگدانەوەی ئەم دەورە و ئەم ڕەوتەیە. زۆربەی شار و گوندەکانی خۆرهەڵات و باشووری کوردستان گەڕاوە و ساڵەها مامۆستای شۆڕش بوە وانەی «مێژوو»ی بۆ لاوانی پێشمەرگە گوتوەتەوە. دوو دەفتەری شیعری بە ناوەکانی «قەڵەم» و «لە چاو نەبین و بینا» لە چاپ دراوە و چەندین شیعری بوونە گۆرانی و سروود. نووسینەکانی لە گۆڤاری پێشەنگ ئاڵترناتیو، پێشڕەو و شۆڕش...دا بڵاو بوونەوە. کاری تەرجەمە، کورتە چیرۆک، ڕەخنەی هونەری و سیاسی و مەقالەی ئەدەبی و مێژوویی، بەشێکی تری لە کارەکانی ئەم هونەرمەندە پێک دێنن. شەبەق ئێستا ماوەی (4) ساڵە لە وڵاتی نەرویج دەژی .

*** تکایە خۆت بە خوێنەران بناسێنە و بۆمان باس بکە، چۆن و لە کەیەوە ڕووت کردە کاری هونەری ؟**

– ناساندنی خۆم بە خوێنەران خۆ ئەگەر هەر بە نووسینی دوو وشەی ناو شۆرەت کۆتایی پێ هاتبا گران نەبوو. بەڵام لە لە لایەکەوە خەڵک هەر بەو دوو کەلیمە لێخەت نابنەوە و لە لایەکی دیکەشەوە بە ناشوکری نەبێ دوو کەلیمەکەش خۆی پێویستی بە شی کردنەوە هەیە. بە شەبەق کە بم ناسن و بانگم بکەن هەر دوو لامان، هەم من و هەم خوێنەر ئاسوودەترین. دەنا منیش وەک «هێمن» ناوێکی دووررودرێژی سەخت و ناخۆشم هەیە. چاکە لە سایەی سەری هونەر و پێشمەرگایەتییەوە ئەوە (23) ساڵە لە کۆڵ ئەو ناوە یەک جار دووررودرێژە بوومەوە.

من خەڵکی دێی «وزنـدرێ»م، گوندەکە کەوتوەتە چەند کیلۆمەتری خۆرئاوای خوارووی مهاباد، لە مهاباد و میاندواو و ڕەشت دەرسم خوێندوە. دوای ڕاپەڕین پاش ئەوەی زۆربەی شارەکانی ئێران و خۆرهەڵاتی کوردستان گەڕام، ئەو جار لە ساڵی (1363)ی هەتاوی (1984) هاتمەدەر و ڕێگای شاخ و دێهاتی کوردستانم گرتەبەر. من ساڵی (1340)ی هەتاوی لە (1961)ی زائینی دایک بووم.

لانکی دێ، باوەشی کراوەی دەشت و مەزرا و هەوای سافی چیای بەرز و بەفرگر، قەڵبەزەی ئاو و بۆنی گوڵەباخەکانی قەراغ چۆم، شنەی بەهاری دڵڕفێن و جریوەی کۆڕی پاسارییە ئازا و شەڕانیەکان، سەگوەڕی دوور و نزیک و شمشاڵی شوان، باعەباع و بارە و پڕمە و لوشمەی مەڕوماڵات و کاروبەرخی سرک و باقی جوانیەکانی سادە و ساکاری دێ، هەر لە تۆخی

منداڵیدا وەها دەرونیان لە شێرەی خۆشەویستی و جوانی پڕ کردم، کە هەر زوو، پێش ئەوەی دەنگم گڕبێت و خۆم بناسمەوە شیعرم نووسی و وێنە و نەقاشی جوانم کێشایەوە، یەکەم شیعرم لە (11)ساڵی بە ناوی «بەهار» نووسی و یەکەم ڕۆژنامەی دیواریم ساڵێک دواتر لەگەڵ چەند هاوکلاسی ترم لە مەدرەسەکەی خۆمان دروست کرد. لەزەتی کاری هونەری وەها چوە بن ددانمەوە کە تا دەهات زیاتر چێشتە دەبووم و هونەر و شێعر بوون بە هاوڕێی گیانی گیانیم و لەگەڵ خۆیان بردیانم. جارێک ئەمن ئەوانم هەڵدەکێشایە سەر ئاسۆی بەرز و جارێکێش ئەوان بە هەڵدێر و ڕژدی ژینی پڕ لە سەرسامی خۆیاندا دەیان بردم کێ دەیگوت ئەوان دەمگەیەننە قوتبی شماڵ و دەیانەوێت هەموو گۆی زەویم پێ بگەڕێن.

من بە قاسپەی کەو گوێم کراوە و بە ویزەی قورقوشمی ئاخرا
لەشم بە تاوی دەشتی هەولێر برژاو دڵ لە یەخچاڵی قوتبێدا سووتا

*** کارە هونەرییەکانی ئێوە زیاتر شیعر و پەخشان چیرۆك و تەرجەمە لە خۆی دەگرێت. چۆن بوو کە ئێوە ئەم بەشانەتان لە بواری هونەردا هەڵبژارد ؟ ئایە ئێوە بێجگە لەم شتانە کاری هونەری دیکە هەیە کە خۆتان پێوە خەریك کردبێت؟**

– زیاتر ئەوە لە بەرچاوە، دەنا زۆرتر هۆگری کاری نەقاشیم، واتە وێنەکێشان بووم. کاری «ڕەنگ ڕەوغەن»م کردوە. ئێستایش هەر کەمکەم تابلۆی چکۆلەچکۆلە دەکێشمەوە، ئەوە (3) هاوینە لە پێشانگای وێنە لە شارێکی کەلتووری نەرویج بەشداری دەکەم و کارەکانم سەرنجی هونەردۆست

و هونەرناسانی ئێرەی ڕاکێشاوە. لە ژیانی پێشمەرگانەدا هیچ مەودایەک بۆ کاری کێشانەوە نەبوو، باشە ئەگەر پەنام بۆ شیعر نەبردبا چم کردبا؟ کاری گرافیکیشم کردوە. کورتە چیرۆک و زۆر چەشنە شیعرم نوسیوە. کاری تەرجەمەم کردوە و دەستم بۆ هەڵدانەوەی لاپەڕەی مێژوو بردوە. بۆ نموونە لە سەر سپارتاکوس شتم نووسیوە. هێندێک ڕەخنەی هونەری و مەقالە شێتەی سیاسیشم هەن.

بۆ خۆت دەزانیت خەریکی کاری چاپ، تایب و مۆنتاژ و عەکاسی، ئێدیت و ئێدیتۆری، ڕۆژنامە و گۆڤاری سیاسی و هونەری بووم. (3) ساڵ سەردەبیری پێشەنگ بووم. جا کاکە چیم پێ نەکراوە، هەر گیرەی دڕوان مابوو، خۆ ئەگەر چەند ساڵی تر لە زڕگوێز مابامەوە ئەوەیشیان پێ دەکرم، ڕاوە ژوشکەکەت لە بیرە!

هەر چەند لەگەڵ شیعر و هونەر ڕەفیقی گیانی بە گیانیم، بەڵام زۆر خۆم بە هونەرمەند نازانم، باشە ئەگەر هونەر نەتوانێت نەغمەکانی دەروونی من بکاتە ملوانکەی بوکی جوانی، ئەگەر من نەتوانم بە یارمەتی هونەر چەپکە گوڵەکانی ئەوین و خۆشەویستی پێشکەش بە ئاشقانی ئازادی بکەم، کوا گونجاو و شیاوی ناوی هونەرمەندم، هەتا ئێستایش پڕ بە دڵی خۆم لە شیعرێک، لە چیرۆکێک، لە تابلۆیەک یان لە نوسینێکی خۆم ڕازی نەبووم:

## «بۆ ئازادی»

بومە شەیدای عەشقی تۆ مەیلی ڕووتم گرتەبەر
دامە ڕێی هات و نەهات مەست و سادە و بێخەبەر
کێوبەکێو خاکی کوردستانم گەڕام و گاڵە مام
تۆ هەر لە سەر دوندی جوانی و ئێستە من لەو چاڵەدام
تاکوو دێی جوانتر دەبی دڵ دەهەژێنی و دەبەی
من لە کوێم ئێستا تۆ لە کوێ ڕامش و عشوەی دەکەی.

***شیعری «بۆ هەوارن دێمەوە» یەکێك لەو شیعرانەی، کە لە ناو هۆگرانی شیعردا جێگایەکی باشی بۆ خۆی ئەستاندوە. تکایە گەر بە کورتیش بوە چیرۆکی ئەم شیعرەمان بۆ باس بکەی.**

– کاک تۆفیق ئەلیاسی پیاوێکی هەڵکەوتوو و پێشمەرگەیەکی بە جەرگ و ئازا بوو. خۆشەویستی خەڵکی ناوچەیەکی کوردستان بوو. وا بزانم ساڵی (1371 – 1372)ی هەتاوی بوو، بە پێی پیلان و جاسوسی سیخوڕان لە ماڵێکدا لە ئاواییەکی بچووک لەگەڵ چەند هاوڕێی گەمارۆ دەدریت دوای شەڕێکی کورت بە برینداری دەکەوێتە دەست دوژمن. یەک دوو جار لە نێوان کوردستان و تاران هاتوچۆی پێ دەکەن، نیشانی زۆر کەسی پایەبەرز و شکەنجەگەڕی دڕ و بە تەجرەبەی دەدەن. هەموو ئەشکەنجەیەکی لە سەر تاقی دەکەنەوە، لە شی بریندار و چاوە نەبووی لە ژێر ئەشکەنجەدا کوتکوت دەکەن، دەست و لاقی دەبڕنەوە پاشان لە وەها حاڵەتێکدا ئێعدامی دەکەن. من بە هۆی دۆستایەتی نزیک لەگەڵ خانەوادەی و منداڵەکانی ئاگاداری وەزعی ئەو دەبووم. ڕژێم و جەلادەکانی هەر چەند وەخت جارێک خوشکی یان خزمێکی نزیکیان دەنارد، تا دوای

چاوپێکەوتنی کاک تۆفیق بێت بۆ لای ئێمە. ئەوان بەم شێوەیە جەرگی ئێمەشیان دەرزی ئاژن دەکرد. نەفرەت و تورەی لەم هەموو حەیوانیەت و دڕەندەیەیە سەراپایی دڵی داگرتم. کاتێک ئیتر دەروونم سەر ڕێژ بوو «بۆ هەواران دێمەوە»م نووسی. ئەوسا جا کەمێک سوکنایم هات. تۆزێک دامرکامەوە.

شییعرەکە خراپ نەبوو. دەست بە دەست ڕۆی و کەوتە دەستی هەزاران کەس، لە خەڵکی کوردستان. کرا بە گۆرانی و سروود و لە دوو سێ جێگاش چاپ کرا. پێم وایە لە داهاتوشدا هەزاران لاوی شۆڕشگێڕ هەستیان بەو شیعرە گڕ دەگرێتەوە و بەرەو ڕووی جەلاد و زۆرداران دەبنەوە. بەڵێ ڕاستە ئەم شیعرە جێگەیەکی باشی بۆ خۆی ئەستاندوە.

## «بۆ هــــــەواران دێمەوە»

شـــــەوی ئەنگـــــوســـــتەچـــاو دەبــــڕم
بـــــــەربـــــــەیـــانی دێـمـــــــــــــــەوە
خــــــــــۆ لـــــە عیشـــقی شـــــەم دەدەم
بــــــــــــــــــۆ ژوانی دێـمـــــــــــــــەوە.

تـــــرپـــــــەی دڵـــــی ئـــــەم شـــۆرشـــــــەم
شـــــەو لە ســــــوێیان دێـمـــــــــــــــەوە
گـــــــــــڕ لـــــە شـــــــــــەوگـــار بەردەدەم
بـــــە گـــــــــــڕ باران دێـمـــــــــــــــەوە.

لـــــە ســـــەر لـــــوتكـــــەی بـــــەرزی هیـــــــوام
ڕۆژ و شـــــــــــــەو دەشـــنـێـمـــــــــــــەوە

بۆ ئەوینێک سەر دەدەم
وەک هەزاران دێمەوە،
وەک هەزاران ئارەزووم
دەچمە گیانی تازەوە
دەبمە تۆی شینی بەهار
بۆ هەواران دێمەوە،

چاو بە چاوان چا دەکەم
ڕۆح بە گیانان دادەکەم
وەک شەماڵی خەم ڕەوێن
بۆ بێساران دێمەوە،
ڕێ! بە من ڕێیە
شاخ! بە ودمی من دەژی
باوەشی دەشت بۆ منە
بۆ چەمشاران دێمەوە،

سا وەرن بیگرنەوە
هەرچی ڕێگە و ڕێچەیە
سا وەرن بیسڕنەوە
هەر کوێ شوێن پێی من هەیە،

من دڵی شاری سنەم
شاخی هەورامانی چڕ
شان و باهۆی پاوەمە
مێشکی کوردستانی پڕ،

سا وەرن بیبڕنەوە
چپەی ناو مەیدانی کار
ئێعدامی کەن یەکبەیەک

دەنگوباس و خەڵكی شار،
گڕ و ئاورینگی ڕاسانم
لە كووره و كان و كارگا
چی لە دەریا دەكەن؟
هەمیسان هاكا تۆفان كا!،

ڕێ مەدەن دەنگ بێتەدەر
ڕێ مەدەن باس بێتەوه
ڕێ مەدەن سامی شەو بشكێ
ئاوری گیان هەستێتەوه،

ڕێ مەدەن پێخوستانی شار
كۆڕ و كۆمەڵ ساز بكەن
بۆ بە هاواری یەككگری
ڕاستەقینە باس بكەن،

چی لە تواناتان هەیە
ڕێكی خەن ئامادە و تەیار
تەك تەكی ئەم خەڵكە بگرن
بۆ بە زیندان دێ و شار،

* * *

ئەو گڕەی وا لە سەرما بوو
دێت و گڕ دەگرێتەوه
شار و گوندی كوردەواری
پڕ بە پڕ دەگرێتەوه،

هــــــــەر قـــــەتــرە خـــوێــــنــێــکــم
ئـــــــــاڵای بــــــاڵایـــــەکــــی بــــــــــەرزە
هـــــــــەر دڵـــــــــــە وا لــــــــە ڕێـــدایــــە
هــــــــــەر ڕابـــــــــــــەرە وا دێـــتـــــــەوە،

ڕازی گـــــــــــــــەورەی ســـــــــــــەردەمـــم
تـــا بـــــکـــــــوتــــــرێ ئـــــەم ســـــــــــەرەم
زەبــــــــــــــــــری قـــیـــنــــــــــــاویــــــــتــــرە
جـــــــــــەنـــگـــــــاوەری کــــــۆمـــــــەڵـــــــەم!

**1372 – 1993**

**زرگوێز**

*** ئێوە چەند ساڵێکە لە دەرەوەی کوردستان دەژیـن، بەڕای ئێوە جیاوازی هەیە لە نێوان نووسین لە کوردستان و نووسین لە غوربەتدا؟**

– بە سەری تۆ خۆ لە مێژ نییە هەڵاتوومە دەرێ. وەڵاهی هەڵیش نەهاتووم بە زۆر هێنایانم. لەوێ ئینسان هەست بە توانای خۆی دەکات و لێرەش بە نەتوانی و بێ هێزی. لەوێ گڕ دەگری و لێرە دادەمرکێیەوە. لەوێ غرورت غاڵب دەبێت و لێرەش غەریبی غەورت دەکاتە دڵ. ئەی چۆن کاکە فەرقی نییە! فەرقی زۆرە. لەوێ ئەوە تۆ بووی دەتنووسی، لێرە خۆت دەنووسرێیتەوە. لەوێ ئێمەومانان جێگای ئیشارە بووین و لێرە زۆرمان وەک قەفی عەلامەتی سوئالمان لێ هاتوە. چەماوینەوە. لێرە کاتێک لە پشت هەر جوملەیەک قەرار دەگرین خۆمان دەکەوینە کەوانەی شک و گومانەوە. ناحەز و لێڵ و توڵخ دەنوێنین. لەوێ بە نوری خۆمان دەدرەوشێینەوە، شەبەقی خۆمان بوین.

تۆ دارەبەنێک لە شاخ هەڵکەنە نیوەی زیاتری ڕیشەکەی با لەگەڵ نەیەت، ئەو جار بیهێنە، دوای تێپەڕینی هەزاران کیلۆمەتر لە نزمایی لە قەراغ دەریایەکی سەهۆڵ بیچەقێنەوە. وای دابنێ قەت دەستی ڕیشەی نەگاتەوە شاخ. چی بە سەر دێت؟ چی لێ دەمێنیتەوە؟ ئەدی کاکە گیان ئەگەر لێرە زۆر چاک بنووسینەوە تراژیدیایی شکستی خۆمان دەنووسین. دان بە کەموکوڕیەکانی خۆمان دادەنێن. لێرە تۆزێ غەریبی لەسەر نووسینەکانمان دەنیشێ و پێکەنینمان زۆرجار لە کێشانەوەی لێوەکان واوەتر ناچێ. ژانی غوربەت مگرینێکی بەردەوامە لێرە چارەسەر ناکرێت. نووسین و شیعر و تابلۆکان ئۆخنایی ناخەنەوە گیان. من لەوێ شیعرێکم دەنوسی و لێ دەبوومەوە هەستم بە حەسانەوە و ڕۆح سوکی دەکرد. لێرە هەر قورس و قورستر دەبم. خەم هەیە لێرە هەموو شەوێک مارانگازت دەکا و نابێت بە شیعر. لێرە لە نێوانی ڕەنگدانەوە و ئەوق بووندا، لە نێوان دەستپێک و کۆتایدا، لە نێوان ڕوونی و تارمایدا زۆر شتت لێ ون دەبێت، تا دێیەوە خۆ باوەشێک ئەستێرەی وشەی جوانت لێ ڕژاوە و تازەش بە هیچ خودایک بۆت کۆ نابێتەوە.

**زۆر شاعیری لاو ئەمڕۆ زۆر شانسی پێگەیشتن و گەورەبوونەوەی زیاتریان لە وەفایی و حەمدی و پیرەمێرد و بێکەس هەیە.**

*** گەر بمانەوێت هەڵسەنگاندنێك لە نێوان شیعری شاعیرانی لاوی پێش دوو دەیەی ڕابردوو و شیعری شاعیرانی لاوی ئەم سەردەمە بکەین، چ جیاوازیەك بە دی دەکرێت؟**

– شاعیرانی ئەو دەورەیە زۆر ناناسم، بە داخەوە شیعرشیانم زۆر کەم دیوە. بە ناچاری دەبێت هێندێک کۆنکرێت لەو بابەتەوە بدوێم. یان ئاسودەتر ئەوەیە بڵێم لێرەدا وەک هێمن بیر دەکەمەوە. من پێم وا نییە کە شیعر و شاعیر کۆن و نوێی هەیە. ئەحمەدی خانی ئێستایش هەر خۆش و تازەیە. مەولەوی هەر دڵبزوێن و شیرینە و گۆران هەر وا سیحراوی و خەیام ئێستایش ڕوون و نوێیە. شیعر و شاعیر چاک و خراپی هەیە جوان و ناحەزی هەیە. شیعری گەیوو نەگەیوو هەیە. بەڵام زۆر دەرکی کۆن و نوێی ناکام. تۆ تەماشاکە ئێمە هەمان ئینسانە ناکامەکانی جارانین. دەردەکان، هەستەکان، کۆست و کەرەستەکانیش هەر وەکوو خۆیانن. هێندە ئاڵوگۆڕێکی گەورە ڕووی نەداوە، ئەوینی بە باچوون، لاوی دڵ شمشاڵی کون کون بوو، خوێڕی پێگەیشتوو، ناپیاوی لە خۆشدا سووربوو، خەفەقان، شکەنجە، زیندان، ڕاوەدوونـان، خولانەوە لە بازنەی نانی ڕۆژانـەدا، شکانی قەڵەمەکان و بەستنی دەمی شاعیران، ویزەی گوللە و کرپە و شکانی ئێسک و هاوار و ناڵە و نوزەی نیوە زیندوان، تۆ تەماشا هەموو شت وەک سەد ساڵ لەوە و پێش، وەک پەنجا ساڵ لەوەو پێش، هەر وەکوو خۆی ماوە. زۆر شاعیری لاو ئەمڕۆ زۆر شانسی پێگەیشتن و گەورە بوونەوەی زیاتریان لە وەفایی و حەمدی و پیرەمێرد و بێکەس هەیە. ئەویش لەبەر ئەوەیە کە ئەمڕۆ یەک شتی تازە خەریکی دێتە گـۆڕێ. ڕووداوێـکی گـەورە ئەویش ڕاسـت لە جەرگەی کوردستاندا خەریکە ڕوو دەدات. ڕووداوێـک، کە قارەمانانی پێشمەرگە دەبەزێنێت و ڕابەر و قافڵەوانی نوێ دەخوڵقێنێت. ئەو شتەش بوژانەوەی ڕەوتی هونەریمان بە واتەی ڕوونتر دیاردەی ڕەنسانسی هونەرە لە کوردستان. کاتێک تارمایی قارەمان خوازی

خەباتی پێشمەرگانە لە کوردستان کەوتە ئەنجامی ئاستەنگی و تەنگانە، هونەر دەسەڵاتی مەزنی خۆی هێنایە گەڕ و گەشایەوە. گەوهەری هونەر لە کانە زێڕە ڕاستییەکانی خۆیەوە کەوتە دەرکەوتن و درەوشانەوە. تۆ تەماشای «بەهمەنی قوبادی» بکە. من پێم وایە دەیان و سەدان «بەهمەن»ی ترمان بەڕێوەنە. هەر پێویستە ئێمە بیان بزووێنن و بیان ببینینەوە. کەمێک لە تەنگانە و تاریکی و لە عەزاب و شین دوریان خەینەوە. ئەوسا هونەرمەندی ئەمڕۆ لەگەڵ ڕابردوو لەبەر بوونی لە جەرگەی بوژانەوەدا جیاواز و بەرچاو دەبێت، دیارە ئەمە لە نرخی ڕێچکەشکێنانی وەک قانع، هەژار، هێمن، هەردی، گۆران و بێکەس قەت کەم ناکاتەوە، شاعیرێک لە مهاباد هەیە کە لە نێوانی نەسڵی کۆن و نوێی شاعیرانی خۆرهەڵاتدا چاک جێکەوتوە. پتەو و قایم ڕاوەستاوە. بۆتە پرد. دەستی لەوبەروبەران ڕاخستوە. ئاوێکی بێ برانەوە بە دەوونیدا دەڕوا و میراتگر و میراتپێدەری دوو نەسڵی گرینگ لە شاعیرانی کوردستانە. من ئەو کەسەم زۆر پێ گەورەیە. بە داخەوە من کەم دەیناسم کاک قاسم مویدزادە (هەڵۆ) دەڵێم کە زۆر کەس دیارە دەیناسێت، بەڵام بە قەدەر گەورەیی خۆی هێشتا ناوی لە قوڵایی و بەرینایی وڵاتی کوردا بڵاو نەبوەتەوە. خۆزگە ئەو مامۆستا گەورەمان زوتر و زیاتر دەناسی. شاعیری لاو زۆرن و زۆریش دڵناسکن، من گەر ناوی هەندێکیان بهێنم هەندێکی تریان دەڕەنجێن. ئەوەی دادەنێم بۆ کاتێک کە دەرفەتی خوێندنەوەی شیعری زۆربەیانم هەبێت، لە لایەکی دیکەشەوە من لە پێگەیەک دا نیم هەڵسەنگاندن بکەم لە سەر شاعیرانی کۆن و نوێ یان چاک و خراپ، من لە دەرەوەی باخ و دارستانەکەم ڕەنگە بە سەدان گوڵی بۆن خۆش و جوان

لە قوڵای بەر و باخی تازەماندا هەبێت، کە من بە داخەوە هەر چاویشم پێیان نەکەوتوە. هەر بۆنیشم پێوە نەکردوون.

*** بە لەبەرچاوگرتنی دۆخی حەساسی کوردستان، شاعیر و نووسەری کورد بە تایبەت هونەرمەندانی لاو دەبێت چ ڕۆڵ و دەورێك بگێڕن؟**

- بارودۆخ حەساس بێ یان نەبێ هونەرمەندی لاو دەبێت حەساس بێت. پێویستە لە هەر ڕووداوێک بە تێبینییەوە وردبێتەوە. سەرنج بدا و بە چاوێکی کراوە تەماشایی چوارەوری خۆی بکات. جارێک لە ناوەوە و جارێک لە دەرەوەی دارستانەکە بڕوانێتە ورد و درشت و دوور و نزیک. دەبێت بخوێنێتەوە. نابێت هیچ پرسیارێک بە بێ وەڵام فڕێ بدات و شت لە کۆڵ خۆی بکاتەوە. دەبێت تەجروبە و مێژوو بکاتە دوربینێک، تا دەشتە سەوزەکانی کۆنی ئازادی و باغچە ئەسیرەکانی ئەمڕۆی دەورووبەری بەڕوونی ببینێت. دەبێت دەردهەڵگر و دڵ بە بەرگە بێت. ئەگەر گوڵێکی ژاکاوی دی وەکوو خەڵکی تر پێشێلی نەکات. بە سەریدا ڕانەبرێت. بۆی کرا دەبێت بیبوژێنێتەوە. دەنا بیکاتە ئاڵای چیرۆک و شیعری خۆی. بە دینی باڵندەیەکی باڵشکاو دەبێت ئارەزووی فڕینی زیاتر لە دڵدا دروست بێت و نابێت فڕینی تەنیا بۆ خوی بوێت. نا، ئاسان نییە. لە هەر بارودۆخێکدا هونەرمەندبوون کایە نییە. کایەش بێ ئەوە کایە بە ژیانە. هونەرمەندی لاو پێویستی بە ئەزموون هەیە، دەبێت عەشق و ئەشک، ئازادی و ئازار بناسێت و نەک هەر قسەیان لێ بکات. هونەرمەند و شاعیری لاو، بێ تێوەچوون، بێ قوڵبوونەوە، بێ تێگەیشتن، بێ ئازارکێشان و فرمێسکڕشتن و بێ ئیدە و هیوا و هەوێن، ناتوانێت لە سەر قاچی ئیدعای هونەرمەندی ڕابوەستێت. یەکەمین ئەسڵی

هونەرمەند بوون لە هەر هەلومەرجێکدا ئەویندارى و وەفادارییە بە خۆشەویست و خەڵک و خاک و لانەکەى. ئەوە ئاسان نییە. دنیایى ئەمڕۆ گەوج خوازە. پیاوى گەوج زوو سەردەکەوێت و پێدەگات. کەسى وشیار و دەردەدار و ڕاستگۆ دەشکێنێتەوە و فڕێى دەدات، تا بۆى بکرێت ڕێ لە گەورە بوونەوەى دەگرێت. لە خاکوخۆڵى وەر دەدات، ئەسیر و زیندانى یان ماڵ بە کۆڵ و دەربەدەرى دەکات. بۆیە هونەرمەندى کورد ئەغڵەب دواى مەرگى ناو دەردەکات. هێمن بە خۆڕاى وا ناڵێت «هونەرمەند و ژیانى خۆش مەحاڵە، هونەرمەند ڕەنجەڕۆیە ژینى تاڵە».. بە هەموو ئەوانەوە من پێم وایە هونەرمەند دەبێت دڵ گەورە و بێ نیاز بێ. بێمەنەت بنووسێت و سەرى بەرز ڕابگرێت. چاو لە دەستى، شیاوى ئینسانى هونەرمەند نییە. هونەرمەندى لاو دەبێت ژیان بکاتە مامۆستا. دەبێت زاتى خۆى بە بەباوەڕ بەخۆیى و ئازادەگى بخارێنێ.

*** گۆڤارى پێشەنگ، کانونى هونەر و ئەدەبیاتى کرێکارى کوردستان یەکێك لەو گۆڤارە دەگمەنانە بوو کە کاتى خۆى لە بارودۆخێکى زۆر ئەستەمدا بە زمانى کوردى و فارسى بڵاو دەکرایەوە، ئێوەیش یەکێ لە کارگێڕانى چالاکى ئەم گۆڤارە بوون بەڵام بە داخەوە ئێستا «پێشەنگ» بڵاو نابێتەوە. دەتوانن هۆکارەکەى باس بکەن؟**

– ئەوانەى کانونیان پێک هێنا، ژمارەیەک هونەرمەندى ناو کۆمەڵەى زەحمەتکێشان بوون. لەگەڵ ڕەوتى شۆڕش و ئاڵوگۆڕەکانى کۆمەڵە ئەوانیش ئاڵوگۆڕیان بە سەردا هات. ژمارەیەکیان بە داخەوە گیانیان بەخت کرد. ئەوانى تریش وردەوردە بڵاو بوونەوە، زۆربەیان پەرتەوازەى هەندەران بوون. هێندێک ناویان دەرکرد و هێندێک بە دڵ بەقوڵدا چوون. هەندێک

دەس و خامەیان هەر وا ڕەنگینەوە و هێندێکیش لەبەر زۆر سیاسی بوونەوە لە هێلکە چوونەوە. من کۆڕی کانوونم پێ خۆش بوو. پێشەنگم زۆر خۆش دەویست. کاتێک هەموو دەستیان لێ بەردا من هەر وا چەند ساڵێکی تریش لەنگەرم ڕاگرت. ژمارەکانی (14، 15، 16) من سەردەبیریان بووم و دەتوانم بڵێم سەرجەم کارەکانیان هەر لە کۆکردنەوەی بابەت، تایپ، مۆنتاژ و ئیدتیانەوە بگرە تا چاپ و بڵاوکردنەوەیان خۆم کردم.

ئێستا دوو کۆمەڵە هەیە و دوو گۆڤاری هونەریش بە پاڵیانەوە دەردەچێت. یەکێکیان بە ناوی «سپیتر» و ئەویتریان هەر بەناوی «پێشەنگ». دیارە هیچ کام لەوانە پێشەنگی پێشوو نیین. نەک لەبەر ناوەرۆکیان، بەڵکوو لەبەر ئەوەی هونەرمەندانی پێشووی کانون نووسەرانی ئەم دوو گۆڤارە تازەیە نیین. ئەگەر قسە لە ناوەرۆک بێت لەوانەیە پێشەنگی ئێستا و سپیتر تەنانەت شتی باشتریشیان تێدا بڵاو بکرێنەوە. بەداخەوە من لەوانەیش دوورم.

*** هاوڕێ شەبەق ئێوە ساڵانێکی زۆر پێشمەرگە بوون لە نزیکەوە لەگەڵ جەماوەردا پێوەندیتان هەبوە زۆربەی گوند و ناوچەکانی کوردستان گەڕاون، بێ شك ئەم تێکەڵاوی و نزیکییە کاریگەری لە سەر ئێوە هەبوە. ئەم کاریگەرییە چەندە لە شیعرەکانی ئێوە ڕەنگی داوەتەوە؟**

– ڕاستت بوێ من هێمن هانی دام، تا لە جیاتی زانکۆ هەگبە بەکۆڵمدا دەم و بچمە خزمەت دایە گەورە و پیاوانی پیر و پاک و سادە. بچمە خزمەت مامۆستایانی ڕاستەقینەی زمانی کوردی. بچمە کۆنەدێ و حزمەت گوندیەکانی شیرین زمانی دوورە شار، بچمە ناو گوڵزاری وشەی ڕەسەنی کوردی. ئەو کات من تەنیا (20) ساڵ بووم، ئەو ئامۆژگارییەیی هێمن وەکوو

خوێن لە دڵ و دەرونم گەڕا و ئارام و قەراری لێ بڕیم. دووساڵ دواتر ڕۆیشتم. وەشاخ کەوتم. ئەو ڕێیەم وەها گرتەبەر کە بوو بە ژیانی ڕاستەقینەم و لاویەتیم لە سەر دانا. (17) ساڵ پێوام، (17) ساڵ دێ بە دێ دۆڵبەدۆڵ مەزرابەمەزرا، شوان بە شوان و ڕێگابەڕێگای کوردستان گەڕام و لە خزمەت هەزاران داپیر و پیاوانی تەمەنداردا دانیشتم گوێم لە سەدان چیرۆک و بەسەرهاتی تاڵ و شیرین گرت. لە قون تەندوران دانیشتم و تامی شیرین زبانی داپیرەکان و نانی گەرمە تەندورم کرد. لە بەربەڕۆچکەی سەدان مزگەوت و لە گوێسوانەی هەزاران ماڵ هەڵتورشکام و گوێم بۆ پیرانی چازان شل کرد. سەدان بەسەرهاتم بە چاوی خۆم دیت. لە سەدان سەرگوزەشتی تاڵ و شیریندا خۆم بەشداریم کرد، هەموو کات و هەموو ڕۆژێکیشی هەگبەی دڵ و مێشکم لە مێوژ و گوێزی وشەی ورد و ڕەسەنی کوردی ئاخنی و پڕ کرد. جوانییەکانی خۆڕسکی ئەو ژیانە پڕ بەسەرهاتە تا ڕادەی شێتی هەست و سەرنجیان ڕاکێشام. هەرگیز بیرم لەوە نەکردەوە کە ژیانم لە خەتەردایە یان لە هەڵبژاردنی ئەم ڕێیە هەڵەم کردوە. هەڵبەتە زۆر خۆشەویستم لە دەست دا، وە داخی گەورەشم ئەوەیە کە گەورەترین مامۆستای خۆم «هێمن»م تازە نەدیتەوە. ئەگینا ئەگەر ژیانی داهاتووم هچی تێدا نەبێت هێشتا هەوێنی سەدان شیعر و چیرۆکم لە دڵ دایە. ڕابردووی ژیانم هەر دەم جێگای شانازی و غرووره بۆم.

پێم وایە تەجروبەی ژیانم، گەڕان بە کوردستاندا و تێکەڵاویم لەگەڵ کۆمەڵانی خەڵک لە هەر چین و توێژێک، تا ئەمڕۆ زۆر لە شیعر و نوسینمدا ڕەنگی نەداوەتەوە، بەڵام کارتێکردنیان لە سەرخۆم قوڵ و حاشا هەڵنەگرە. ئەوە ئەرکێکی گەورەیە

لە سەر شانم کە ئەمەکی چاکە و نان و نمەکی وان بدەمەوە. هیوارم لەم ڕێیەدا شیاوی ئەوە بم ناوم لە ڕیزی دۆستانی ڕاستەقینەی خەڵکی کوردا بنووسرێتەوە.

*** هاورێ شەبەق ئێوە چ پرۆژەیەکتان لە بەردەستدایە بۆ داهاتوو؟**

– بە ئەندازەی کتێبێکی باش شیعری نەدیتراوم کۆ کردوەتەوە. بە تەمام چاپیان بکەم. دەستم داوەتە وەرگێرانی ڕۆمانی «سپارتاکۆس» لە نووسینی هورات فاست/ تەرجەمەی ئیبراهیم یۆنسی. دیارە بە سستی چوومە پێش، بەڵام هیوادارم ئەو کارە بە ئەنجامی خۆی بگەیەنم.

(10–15) وتاری ڕەخنەی هونەری و سیاسیم نووسیوە لە گۆڤار و شوێنی جوێ جوێ بڵاو بوونەوە. بەڵام بە تەمام ئەم جارە یەک جێ لە کتێبێکدا چاپیان بکەم. هەڵبەتە خەونی تریشم هەن. تەمەن مەودا بدات هێزی نووسینم هەبێت بیرەوەریەکانی کاتی پێشمەرگایەتم دەکەمە هەوێنی چەند چیرۆکێکی نوێ. بۆ هەموو ئەو کارانە پێویستم بە هاورێ و هاوکار هەیە. بەڕاستی من بە تەنیا ناتوانم شتەکانی خۆم تایپ و مۆنتاژ بکەم. خۆ پیاو ناهەقیش نەڵێت دۆست و هاوڕێ باشم زۆرە، بەڵام تا ئێستا کەس نەی گوتوە شەبەق من ئەو کارەت بۆ دەکەم، خۆشم ڕووم لە کەس نەناوە.

**لە هەموو کاتێکدا بترسێ**
**لە کاتی نووسیندا هەرگیز مەترسە**

*** بۆ قسەی کۆتایی گەر پەیام یان وتەیەکتان هەیە، فەرموون ؟**

– هەر کات دەبینم دۆستێکی ڕاستەقینەی خەڵک یان

شۆڕشگێڕێک دەست بۆ قەڵەم دەبات، هەر کە دەبینم، هونەرمەنێکی ئاشق و شەیدا باڵی ئەسپی یاخی خەیاڵی وەبەر شنەبای بەهار و خۆشەویستی دەدا، هەر کات دەبینم چەند هاوڕێیەک یان کۆڕێکی گەش بین لە سەر کانی هونەر و شیعر دەستی یەکیان گرتوە هەڵدەپەڕن. هەر کات هەست دەکەم چاوێکی نەنوستوو، هەستیکی بێدار لە درزی دەلاقەی ماڵەکەیدا چاوی بڕیوەتە ئەستێرەکان و بە داگیرساندنی چەند وشەی پڕشنگدار شەقڵی شەوی شکاندوە، لەو کاتانەدا وەک مەستێکی شەش دانگ، وەک ئاشقێکی بە ئەوین شاد بوو، وەک شەڕکەرێکی سەرکەوتوو خۆ بە بەختەوەر و رەزامەند دەبینمەوە، بە هەموو وجوودم هەست بە شانازی و زیندوویی دەکەم. من بەخیل نیم و پێم خۆشە بوکی جوانی ئازادی هەزاران هەزار ئاشقی لاو و شەیدای هەبێت، پەیامی من بۆ هەر هونەمەندێکی لاو ئەوەیە ئاشق ببە، لێی گەڕێ با دڵت بە هەموو گەرمی و هێزی خۆیەوە بۆ ئازادی بکوتێ و لێ بدات. کاتێک دەست بۆ قەڵەم بەرە کە خامەت شەیدای و شێری و شیبایی پێوە دیار بێ. زڵف و کاکۆلی هەستت وەبەر شنەی ڕاستگۆی بدە و خۆت ڕەها کا، بەو چەشنەی کە باڵندەیەک لە ئاسمان باڵ دەکاتەوە و سینەی وەبەر شنەی بەهار دەدا و دەندوکی بە چریکە و نەغمەی ئەوین دەکاتەوە. لە هەموو کاتێکدا بترسێی لە کاتی نووسیندا هەرگیز مەترسە. ئەوە و تەنها ئەوە ڕەمزی هونەرمەند بوونە.

*ئەوین گۆڤارێکی ئۆرگانی کۆڕی هونەری لاوان و شۆڕشە.
ئەم چاوپێکەوتنە لە ژمارە (17)ی ساڵی پێنجەم بڵاوکراوەتەوە.

# یاری جاران کوان؟

وەفاداران، وەفاداران، وەفاداران، کوان؟
یاری جاران، یاری جاران، یاری جاران، کوان؟
عاشقانی نێو تەڵان و سەخرە ساران، کوان؟
دڵ پەرەستی، گوڵ پەرەستی، سەوزەزاران، کوان؟
ئەو دڵانەی کە هێلانەی عیشقی شیرین بوون
ئەو گوڵانەی کە پەیمانەی جەرگی خوێنین بوون
وەی لەڕاو و وەی لەداو و وەی لە چاوی من
شەونخوونی و بیرەوەری ئاڵۆزاوی من
وەفاداران، یاری جاران، یادگاری زوو
لە دووریتان، دڵی شەیدام، ئاوری تێ بەربوو

**1369(1990)**

**بۆتێ**

حسێن شەبەق، لە زومرەی ئەو شاعیرانە بوو، کە دوای شۆڕشی گەلانی ئێران و ئەو ئاڵوگۆڕە سیاسی و کۆمەڵایەتییانەی ڕووی دا، تەنانەت کاریگەریی گەورە و قووڵی لە سەر ژیان و بیرکردنەوە دانا، ڕەنگە ئەوە فاکتەرێک بوو بێت بۆ کاریگەریدانان لە سەر ڕەوت و ڕێبازی ئینسانی و شۆڕشگێڕانە و دواتر لە شیعر و شۆڕش نزیک دەبێتەوە، وەکوو خۆیشی دەڵێت «لە ڕێگای ئەدەبەوە چوەتە ناو شۆڕشەوە».

بەڵام جیا لەوانە هەستی ئینسانی و شۆڕشگێڕانە لە وجودیدا هەبوو، بۆیە ئەو کاتەیش ناوی بۆ زانکۆ دەردەچێت و بیر لەوە دەکاتەوە ببێتە پێشمەرگە، بەڵام لەو نێوەندەدا خۆی بۆ ساغ نابێتەوە، تا دوا جار مامۆستا هێمنی شاعیر، پێشنیاری شاخ و گوند و شۆڕش و پێشمەرگایەتی بۆ دەکات، ئەو کات و زەمەن و سەردەمەیش گەرمەی شۆڕشی کرێکاری و سۆسیالیستی و کۆمۆنیستی بوو لە هەر دوو دیووی کوردستان و ناوچەکەدا.

ئەم هەلومەرجە سیاسییە، کاریگەری لە سەر ئەدەب و هونەریش هەبوو، کە تەواو جەوێکی ئەدەبیاتی کرێکاری و چەپ و ئینسانی باڵی بە سەر ئەدەبیاتی کوردستانیشدا کێشا بوو، حسێن شەبەقیش لە ژێر کاریگەریی ئەم فەزا سیاسی و ئەدەبییە بێ تاسیر نەبوو، وەکوو خۆیشی دەڵێت «لەگەڵ هاتنە ناو ڕیزی شۆڕش، کەوتە ژێر کاریگەریی (ئەحمەد بازگری شاعیر و د. جەعفەر شەفیعی)».

ئیتـر جەوی واقیعی و کرێکاری شـۆڕش و ئۆردوگا و خۆشەویسـتی بۆ ئەو هەلوومەرجەی کوردستان، شەبەق دەسـتی دایە شیعرنووسـین و واقیعیەتی ئەو سەردەمەی گواستەوە بۆ ناو وشە و شیعر و مێژووی ئەدەبیات.

لە شیعری (یاری جاران کوان؟) حسێن شەبەق، لە دێڕی یەکەمی شیعرەکەدا باس لە ڕووداوێک دەکات، هەر چەندە پێ دەچێت شـیعرەکە هاوکات بێت لەگەڵ کارەساتی بۆتێ، کە بیست و سێ ئەستێرەی سووری چەوساوەکان و بیست و سـێ ئەسـتێرەی ڕێبازی کرێکاران و زەحمەتکێشان بە هۆی بۆردومانی کیمیاوی بەعسەوە گیانیان لە دەست دا.

ئەوانــە کــوڕان و کچانێک بوون، ڕەزمەنــدە، منداڵانی نێـو کورەکان و مەزراکانی لادێیەکانی کوردسـتان، پاش دەیان جار دەسـت و پـێ نەرمکردن لەگەڵ ڕەنج و ئازار و مەینەتـی و هەڵگرتنـی دونیایـەک ئـارەزووی گـەش و جیهانێـک لـە تامەزرۆیی گیانیان نایە پێنـاو ئازادی و دونیایەکی باشتر.

وەفادارانی شەبەق و یاری جارانی ئەو ئەستێرە گەشانەی ئاسـمانی کوردسـتان بوون، کە هاوڕێ و هاوسـەنگەر و هاوڕێبـازی شـەبەق بوون، وەکوو خۆیشـی دەڵێت «ئەم شـیعرە و بەشـێکی تری شـیعرەکانی لـە هەلومەرجێکی تایبەتـی و پاش شکسـتی شۆڕشـی پارتیزانی کـە هاتینە ئۆردوگا و دواتریش بە هۆی هەلومەرجی دژواری ئۆردوگا و سـەختی ژیان زۆر لە هاوڕێ پێشمەرگەنمان وردەوردە کۆچیان کرد بۆ ئەورووپا و ئێمەیان جێ هێشت»، هەموو

ئەوانــە دڵی پــڕ کــرد و بیرکردنەوەی پڕ بوو لە وشــەی کوردی و وەختێک کە دڵ پڕ بوو لە وشەی گەش و جوان، ئەو دەمە هەســتی ئینسانیش باشــتر تەرجەمە دەکرێت و دەهۆنرێنەوە و دەبێتە ڕایەڵەیەکی پڕ زەنگیانە.

شــیعر بە گشتی و لە ناویشیدا شیعری کوردی، دابڕاو نییــە لە شــیعر و ئەدەبیاتی جیهانی، بــە قەدەر و قودرەت و ئیمکانــی خۆی، بۆیــە وەکوو هەموو دەقێکی تر دەکرێت لە ناو شــیعری کوردیشیدا بگەڕێت و بیدۆزیتەوە، گوتاری ئازادی، گوتاری سیاسی، گوتاری ژن و گوتاری ئەدەبیاتی کرێکاری، چونکە ئەمە خۆی لە خۆیدا یەکێکە لە ئەرکەکانی شیعر و ئەدەبیات.

بــەم حاڵــەوە شــیعرەکانی حســێن شــەبەقیش بەدەر نییــە لەوەی کــە دەیەوێت مێــژوو و گوتاری سیاســی و هەلومەرجــی دەیەی هەشــتا و نــەوەدەکان بگێڕێتەوە، کە مافی ئەساسی حەرەکەتی چەپ و مارکسیست و کرێکاری بــوە یــان بەشــێکی ســەرەکی بوە، لــە ناو ئــەو ڕەوت و جەریانانەی دەور و نەقشیان هەبوە.

تا لە دێڕی دووهەمی شــیعرەکەدا دەڵێت: عشــقانی نێو تەلان و سەخرەســاران کوان؟ دڵپەرســتی گوڵ پەرســتی سەوزەزاران کوان؟ ئەمانە ئەو چهرە خۆشەویستانانەن، کە ســەردەمێکی زۆر ژیانیان لە نێو شاخ و تەلان و زەنویری سروشــتدا بوون، لە ناو دەشــت و شــاخ و کوێستانەکانی کوردستان بوون.

ئەوانەی دڵ پەرست و گوڵپەرست بوون و سروشتیان لە باوەش گرتبوو، ئەو دڵانەی کە هێلانەی عشقی شۆڕش بوون، ئەو گوڵانــەی کە پەیمانیان بە ژیان داوە، جەرگیان پڕپڕە لە خوێنی گەشــی کچان و کوڕانێک کە پەروەردەی شاخ و دۆڵی پڕ لە ژانی کوردستانن.

شــەبەق، لە سەر و ســۆراخی ئەو ئازیزانە دەپرسێت، چیــان لێ هــات؟ خۆی بــاش دەزانێ، ئــەم ئازیزانە باج و قوربانیبوونی شــەڕی دوو جەلاد و شەڕەنگێزی ناوچەکە دەدەن، بەڵام ئەوانەی گیانیان لە دەســت داوە، فریشــتەی سروشتی کوردستان بوون، ئەوان کچ و کوڕانی خانەوادە هەژارەکانی کوردســتان بوون، کە دڵیــان پڕ بوو لە کەیل و عشــقی ئــازادی، ئەوانــە شــیرین و فەرهــادی کۆمەڵگا بــوون، ئەوانە مەم و دێوانەی ناو ئەم شۆڕشــە ســورەی زەحمەتکێشانە، کە پڕپڕە لە عشق و خۆشەویستی، پڕە لە دەســتی پڕ لە گوڵ و پڕە لە دڵی پڕ لە ئەســتێرەی سوور، ئەم ئەستێرە سوورانە توێشوویان پڕیەتی لە گوڵ و عشق و هێلانەی دڵە شکاوەکان و دڵە پەراوێزخراوەکان.

ئەمانە بەریئترین ئینســانەکانی سەر گۆی زەوی بوون لــە ناو دۆڵێکی بچووکی ئەم جیهانە ئاڵۆزەدا. کوشــتنی بە ناهــەق و نــاڕەوای ئەوان بە دەســت دەوڵەتانــی دڕندە و ســەرمایەدار، نەیتوانی ئاواتەکانی ئــەوان بۆ بونیات نانی جیهانێکی نوێی شــیاوی  ئینســانی ئازاد و بەرابەر، لە بار بەرێ . ڕێگای ئەو ئازیزانە ئێستاش هەر درێژەی هەیە

هەر چەندە بۆچوونێک هەیە دەڵێت «مەرج نییە شـــیعر هێندە ســـادە و ئاســـان و بێتە خوارو هەموو کەس توانای تێگەیشتنی هەبێت، بەڵکوو پێویستە وەرگر ئاست و توانای خۆی بەرێتە سەر بۆ تێگەیشتن لەو شیعر و دەقانە».

ئەگـــەر چی، ئـــەم بۆچوونە ڕاســـتی و هەقیقەتی تێدایە، بەڵام دەتوانین پێچەوانەکەشـــی لە هەندێک لە شیعرەکانی شـــەبەق دا هەســـت پێ بکەین، بەو مانایەی سادە و ڕەوان و بێگرێ و گۆڵن و خوێنەر دەتوانێت بە سادەیی لە مانا و ناوەڕۆکی شـــیعرەکان تێ بگات، ئەمەیش دیوێکی تری ئەو بۆچوونەیە کە دەڵێت «شـــیعر دەبێت سادە بێت تا هەموو کەس تێی بگات».

لە بەشـــێکی تری شـــیعرەکەدا ئەو کارەساتە وا دەکات، زهـــن و فیکری شـــاعیر ئاڵۆزاوی بـــکات و نیگەرانی بکات لەو ڕاو و داوەی لە بەرچاوی ئەو ڕووی داوە«، ئازیزانی یار و یاوەرانی هاوڕێباز و پێشـــمەرگانەی یەک ســـەنگەر گیانیان بەخت کردوە.

هەر چەندە لە بەشـــێک لە شـــیعرەکانی شـــەبەقدا، تام و بـــۆی نەتەوەیی یان ناسیۆنالیســـتی بـــە دی دەکرێت، هەر چەندە شـــەبەق خۆیشی لە ناو ئەو بزووتنەوە کرێکارییەدا بـــوو وەکوو خۆیشـــی دەڵێت «لە پێشـــەنگ کارم کردوە»، نووســـەریش بوە، بەڵام هەر ئەو کات پێشـــەنگ و کانوونی هونەری ئەدەبیاتی کرێکاری مانیفێستی ئاوا بوو، گەرایشی کرێـــکاری و هونـــەری بەرانبـــەر بە گەرایشـــی مەزهەبی و

ناسیۆنالیســتییه، به گشتی گەرایشــه غەیرە کرێکارییەکان، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا هیچ لە تام و بۆی شیعرەکانی شەبەق کەم ناکاتەوە، کە ســەرەڕای ئــەو بابەتە، بەڵام لە زۆربەی شــیعرەکانیدا، ئێمە ڕەمز و ئۆلگــۆ و کارەکتەری کرێکاری و سۆسیالیســتەکان، یان گەرایشــی کرێــکاری و چینایەتی دەدۆزینەوە، کە هەڵگری خەسڵەتی ئەم گەرایشەن.

شــیعرەکانی (قەڵەم، هاوار، بانگەوازی ســوور، تابلۆی ئەشــقێکی زینــدوو، یــاری جــاران کــوان؟) دەکرێــت ئەم دیالۆگــەی نێــوان شــاعیر و شــەهیدەکانە، دیالۆگی نێوان کرێکارێک و شــەهیدەکانە، یان پێشمەرگەیەک و پێشمەرگە گیانبەختکــردوەکان، ئەم دیالۆگە، ئەم ستاییشــە، ئەم وەفا و شــەونخونییە بــۆ بۆنوبەرامــەی هاوڕێکانییەتــی بۆ ئەو ئازیزانــە کــە دڵ و ڕۆحیان پڕ بوە لە هەســتی کرێکاری و ڕێبــازی چینایەتی، پڕ بوو لەوەی ئەوانە منالانی نێو شــاخ و کۆلیتەکانی کوردســتان بوون، دەستیان لە شار و ماڵ و گوزەرانیــان هەڵگرتبوو، بۆ بەدیهێنانی جیهانێکی باشــتر و گەشاوەتر.

حسێن شــەبەق، جیا لەوەی وەکوو شاعیر ناسراوە، لە هەمــان کاتدا چیرۆک و پەخشــانی نووســیوە، بە کوردی و فارســی، لــە هەمان کاتــدا کاری وەرگێڕانیشــی کردوە، لەپاڵ ئەوانەیشدا شەبەق پێشمەرگەیش بوە، جیا لە هەموو ئەوانەیش خۆیشــی دەڵێت «مــن کوڕی گوندم و کرێکار و سۆسیالیســت بووم، دژی چەوســانەوەم، لەگەڵ عەدالەتی کۆمەڵایەتی و بەدیهێنانی دونیایەکی باشــترم، لەگەڵ مافی

ژنانم»، هەموو ئەمانە ئاماژەن بۆ ئەوەی کە شەبەق، بەشێک بــوە لە ئەدەبیاتــی کرێکاری و چینایەتی و خۆیشــی دەڵێ «شــیعر هەڵوێستە»، لە وەڵامی ئەو پرســیارەیش کە چی شتێک لای شەبەق شیعرە؟، دەڵێت «خۆشەویستی، جوانی، شــێتی، بەرەنگاری هەموو ئەو واقیعیانــەی دەورووبەر، کە کار دەکاتە سەر ئینسان، کاردانەوەی ئەوانە و ڕەنگدانەوەی ئەوانە کە لە شعوری شاعیردا دەبێتە شیعر».

شاعیر لە کۆتایی ئەم شیعرەدا دێتەوە سەر ئەوەی بڵێت ئەوانە وەفادارن، هاوڕێی ڕۆژانی ســەخت و تەنگانەن پڕن لە یادگاری، ئێوە ئێســتا نیین، ئێوە کە نیین، دڵی شــەیدام ئاوری تێ بەربوە.

شــەبەق، کاتێک دەکەوێتە بیــری یارانی بۆتێ، لە بۆتێ لــە (1990) عشــق و خۆشەویســتی خــۆی ئاوێتەبوونی ڕۆژانەی ســەخت و دژواری ناو شۆڕشــن، دژی ستەم و دەسەڵاتی تۆتالیتار دەنووسێتەوە.

یادی ئەو ئازیزانە، تا ئێستایش لە دڵی خەڵکی کوردستان ماوە، ڕێز لە یادیان دەگیرێت، بەڵام گرینگ ئەوەیە لە کات و ساتی خۆییدا شەبەق، ئەو چیرۆکەی کردە شیعر و خستییە ســەر زار و دڵی هەموان و دواتریــش هونەرمەند (بەکری لەگزی) کردیە گۆرانی و تام و بۆی تایبەتی پێ بەخشی.

شــەبەق، ئەم کارەساتەی یاداشت کرد و بەرگی ئەدەب و هونــەری ئیحساســی کرد بــە بەریدا و ئەو کارەســاتە ناخۆشــەی کــرد بە دەقی شــیعری و ئاوێــزان و ئاوێتەی سروشت و جوانی و وەفای کرد.

ئــەوان لە دڵــی هەموانــدا زینــدوون، شــەبەق ئەوانی زیندوتر هێشــتەوە، هەوڵی دا تا ئــەوان ئەبەدی کاتەوە و جوانتر نیشانی ئێمەیان بدات.

**2020/3/20**

**سەردەمی کۆرۆنا**

# بیۆگرافیای ح. شەبەق

-لە ساڵی (1961) لە گوندی (وزندرێ) نزیک شاری مەهاباد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە دایکبووە.

-یەکەم شیعری لە تەمەنی (11) ساڵی بە ناوی "بەهار" نوسیوە و بڵاوکردوەتەوە.

-یەکەم ڕۆژنامەی دیواری ساڵێک دواتر لەگەڵ چەند هاوپۆلێکی تری لە خوێندنگەی خۆیان دروست کرد.

-لە ساڵی (1984) چۆتە شاخ و بووە بە پێشمەرگە.

-جگە لە بواری نوسینی شیعر، وێنەکێش و چیرۆک نوسێکی و وەرگێڕێکی بە توانایە.

-کاری چاپ، تایب و مۆنتاژ و عەکاسی, ئێدیت و ئێدیتۆری, ڕۆژنامە و گۆڤاری سیاسی و هونەری بوو کردوە، ماوەی (3) ساڵ وەک سەرپەرشتیاری گۆڤاری (پێشەنگ) کاریکردوە کە بڵاوکراوەیەکی کانونی هونەر و ئەدەبیاتی کرێکارانی کوردستان بووە.

-دەیان وتاری سیاسی و هونەری نوسیوە و لە گۆڤار و ڕۆژنامە کوردی و فارسیەکان بڵاویکردوەتەوە.

-نووسەر ساڵی (2012)، (bachelor) واتە لیسانسی لە بەشی زمان و کلتور لە زانکۆی ڤێستفۆڵد لە نەرویج وەرگرتووە، پاشان ساڵ ونیوێکیتر ماتماتیک و زمانی لە هەمان زانکۆ خوێندووە و ئێستا مامۆستای ماتماتیکە لە بەشی ناوەندی.

-ماوەی چەند ساڵە لە وڵات نەرویج دەژی.

## چاپکراوەکانی ئەنوەر حسێن (بازگر)

**1- (تیر)ستان**

گۆشەی ڕۆژنامەنووسی-**2003**

**2- خوێندنەوەیەك بۆ مەسەلەی گۆڕانی سیاسی لەعێراقدا**

لێکۆڵینەوەی سیاسی-**2003**

**3- قەدەر**

شیعر- **2005**-چاپی یەکەم

**2007**-چاپی دووەم

**4- کورد لە ئاڵووگۆڕانکارییەکانی عێراقدا**

لێکۆڵینەوەی سیاسی-**2005**

**5- ئاشنابوون بە ئەفلاتوون**

پێشەکی و پێداچوونەوە-**2005**-چاپی یەکەم

**2005**-چاپی دووەم

**6- ڕۆمانێك لەگفتوگۆدا – چەند دیدارێك سەبارەت بەشاری مۆسیقارە سپییەکانی بەختیار عەلی**

دیدارو چاوپێکەوتن-**2006**

**7- فایل**

گۆشەی ڕۆژنامەنووسی-**2007**

**8- کورد و قەیرانەکانی عێراق**

لێکۆڵینەوەی سیاسی-**2007**

**9- ئاشنابوون بە ئەرستۆ**

پێشەکی و پێداچوونەوە-**2007**

**10- یاداشتەکانی ڕۆژانی تەنیایی، گابرێل گارسیا مارکیز**

پێشەکی و پێداچوونەوە-**2008**

**11- دۆکیۆمێنت**

گۆشەی ڕۆژنامەنووسی**2008**-چاپی یەکەم

**2008**-چاپی دووەم

**12- دیدار لەگەڵ سێ شاعیری چەپی کوردستانی ئێران**
**- لەئاریێزەوە تا سازو زوڵفا – چوار دیدار لەگەڵ چوار شاعیری ڕۆژهەڵاتی کوردستان**

دیدار و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی-**2009**چاپی یەکەم

**2010**-چاپی دووەم

**13- عێراقی ناهۆمۆجین**

لێکۆڵینەوەی سیاسی-**2010**

**14- چاوەکانی باران**

شیعر-**2010**

**15- سانسۆر**

گۆشەی ڕۆژنامەنووسی-**2011**

**16- عێراقی مۆزایك و ناهۆمۆجین**

لێکۆڵینەوەی سیاسی-**2011**-چاپی یەکەم

**2011**-چاپی دووەم

**17- مۆدێلی حیزبایەتی لەکوردستان**

لێکۆڵینەوەی سیاسی-**2011**-چاپی یەکەم

**2011**-چاپی دووەم

**18- لۆژیك، ئەپستمۆلۆژیا، میتافیزیك لە دیدیی فەلسەفییەوە**

فەلسەفە- **2011**-چاپی یەکەم

**2012**-چاپی دووەم

**19- چۆن بۆت بدوێم - دیوانی شیعری ئەحمەد بازگر**
**- گۆمەشین - دیوانی شیعری ئەحمەد بازگر**

کۆکردنەوە و ئامادەکردن و پێشەکی، شیعر**2011**- چاپی یەکەم

**2021**-چاپی دووەم

**20- سەردەمی چاوەڕوانی**

دیوانی شیعر-**2012**

**21- کاتی دواین قسەیە**

گۆشەی رۆژنامەنووسی-**2012**

**22- رۆڵی (ی.ن.ك) لە دیموکراتیزەکردنی کۆمەڵگەی کوردستان**

لێکۆڵینەوەی سیاسی-**2012**

**23- پریسترۆیکای بەهاری عەرەبی**

لێکۆڵینەوەی سیاسی-**2012**-چاپی یەکەم

**2014**-چاپی دوەم

**2015**-چاپی سێیەم

**2021**- چاپی چوارەم

**24- قەقنەسێك بەسەر ئاویەرەوە**

دیدار لەگەڵ مەزهەری خالقی-**2012**

**25- شاهێنی ئاناوازا**

دیدار لەگەڵ عەبدوڵلا حەسەن زادە-**2012**

**26- گوڵە گەنمێکی قەرسیلی سەوز**

دیدار لەگەڵ ناسر ڕەزازی-**2012**

**27- ملوانکەی شین - دیوانی شیعری شەریف**

کۆکردنەوە و پێشەکی بەهاوبەشی لەگەڵ لوقمان ڕەئوف، شیعر-**2013**

**28- بۆ ئازادی - دیوانی شیعری موسلیح شێخولئیسلامی (ڕێبوار)**

کۆکردنەوە و ئامادەکردن و پێشەکی، شیعر -**2013**-چاپی یەکەم

**2021**-چاپی دوەم

**29- مەلا بەختیار-گوتاری ئەنکەرە، وەرچەرخانی هاوچەرخی کوردایەتی**

کۆ وتاری مەلا بەختیار-**2013**

**30- پێگەی خۆرهەڵاتی کوردستان لە کۆنگرەی نەتەوەییدا**

دیدار و چاوپێکەوتن2013

**31- لە زرگوێزەوە بۆ ئۆکرانیا-دیداری ئیبراهیم عەلیزادە**

دیدار لەگەڵ ئیبراهیم عەلیزادە-2014

**32- لە قەندیلەوە بۆ کۆبانی**

دیدار لەگەڵ جەمیل بایك- هاوسەرۆکی (PKK)، موراد قەرەیلان-

ئەندامی کۆنسەی سەرۆکایەتی (PKK)

دیدار و چاوپێکەوتن- 2015

**33- هەژمونی پەکەکە دوای سەرهەڵدانی داعش**

لێکۆڵینەوەی سیاسی-2015-چاپی یەکەم

2017-چاپی دوەم

**34- بەهاری عەرەبی و مەترسییەکانی فەندەمێنتاڵیزم**

لێکۆڵینەوەی سیاسی-2015 -چاپی یەکەم

2021 چاپی دووەم

**35- هەژموونی هیلالی شیعی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا**

لێکۆڵینەوەی سیاسی-2015-چاپی یەکەم

2017-چاپی دوەم

**36- پێشێلکارییەکانی دژ بە ڕۆژنامەنووسان لە هەرێمی کوردستان**

لێکۆڵینەوە لە ڕەوشی ڕۆژنامەگەری-2016

**37- حکایەتی مرۆڤە ستەملێکراوەکان**

خوێندنەوەی کتێب-2016

**38- داعش و میلیشیاکان**

لێکۆڵینەوەی سیاسی-2016

**39- فاکت**

گۆشەی ڕۆژنامەنووسی-2016

**40- هەرێمی کوردستان و ململانێ ناوچەییەکان لە نێوان دوو زۆن و دوو جەمسەردا**

لێکۆڵینەوەی سیاسی-توێژینەوەی جیهانی-**2017**

**41- هێزەکانی خۆرهەڵاتی کوردستان و پرسی سەربەخۆیی**

دیدار و چاوپێکەوتن-**2016**

**42- کورد لەناو عێراقی مۆزایك و ناهۆمۆجینندا**

لێکۆڵینەوەی سیاسی**2017**- چاپی سێیەم

**2021** - چاپی چوارەم

**43- نفوذ الهلال الشيعي في الشرق الأوسط**

لێکۆڵینەوەی سیاسی- وەرگێڕانی بۆ عەرەبی- عەلی شەمدین-**2017**

**44- کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستان**

**- کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستان بۆچی؟**

لێکۆڵینەوەی سیاسی-**2018**-چاپی یەکەم

**2018**-چاپی دووەم

**45- کوردستان پاش ڕیفراندۆم**

دیدار و چاوپێکەوتن-**2018**

**46- بیبلۆگرافیای بڵاوکراوەکانی دەزگای ئایدیا 2004-2019**

کۆکردنەوەی بڵاوکراوەکانی دەزگای ئایدیا بەهاوبەشی لەگەڵ بابان ئەنوەر-**2018**

**47- ڕەوشی ڕۆژنامەگەری لە هەرێمی کوردستان (2008-2018)**

لێکۆڵینەوە لە ڕەوشی ڕۆژنامەگەری- بەهاوبەشی لەگەڵ پەرژین ئەحمەد-**2019**

**48- جەمیل بایك - فیگەرێکی شۆڕشگێڕ**

دیدار و چاوپێکەوتن-**2020**

**49- ڕەهەند**

گۆشەی ڕۆژنامەنووسی-**2021**

**50- ڕۆژئاڤا: ئۆپەراسیۆنی تورکیا و ئەجێندای ئەمریکا و ڕووسیا**

دیدار و چاوپێکەوتن-**2020**

**51- ئەستێرە سورەکانی ئاسمانی چەوساوەکان- شیعری کوردی و ڕەهەندی چینایەتی**

لێکۆڵینەوەی ئەدەبی-**2021**

**52- بۆ هەواران دێمەوە - دیوانی شیعری حسێن شەبەق**

کۆکردنەوە و ئامادەکردن و پێشەکی، شیعر-**2021**

**53- کوردستان بەهەشتی ئەوروپا و دۆزەخی ئەفریقا**

لێکۆڵینەوەی سیاسی- **2021**

**54 - (تیر)ستان - بەرگی یەکەم - 2021**

گۆشەی ڕۆژنامەنووسی ((تیر)ستان - فاکت)

**55 - (تیر)ستان - بەرگی دووەم – 2021**

گۆشەی ڕۆژنامەنووسی (فاکت – فایل - دۆکیومێنت)

**56 - (تیر)ستان - بەرگی سێیەم – 2021**

گۆشەی ڕۆژنامەنووسی (دۆکیومێنت – سانسۆر – کاتی دواین قسەیە)

**57 - (تیر)ستان - بەرگی چوارەم – 2021**

گۆشەی ڕۆژنامەنووسی (کاتی دواین قسەیە - ڕەهەند)

**58 - پێگەی خۆرهەڵاتی کوردستان لە کۆنگرەی نەتەوەییدا- -2021**چاپی دووەم

(پێگەی خۆرهەڵاتی کوردستان لە کۆنگرەی نەتەوەییدا - کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستان بۆچی)

**59 - پرسی ڕیفراندۆم و سەربەخۆیی کوردستان2021- چاپی دووەم**

(هێزەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان و پرسی سەربەخۆیی - کوردستان پاش ڕیفراندۆم)

**اسم الكتاب: بۆ هەواران دێمەوە**

**الكاتب:** انور حسين (بازگر)

**الموضوع:** مجموعة قصائد (ح. شبق)

**المراجعة:** هيوا كاظم

**التصميم:** اوميد محمد

**الغلاف:** ارام على

**الطبعة الاولى:** 2021

